

# رامان

له تیشکی تێکەڵاو
بە هەورە داخزیوەکانی
سەر قژ و بەژنی چیا!!

نووسەر:
سەید ئەحمەد حەسەنیفەرد

# رامـــــان

له تیشکی تێکه‌ڵاو

به‌ هه‌وره‌ داخزیوه‌کانی

سه‌رقژ و به‌ژنی چیا !!

# رامـــــان

له تیشکی تێکەڵاو

به هەورە داخزیوەکانی

سەرقژ و بەژنی چیا !!

نووسەر:

سەید ئەحمەد حەسەنی‌فەرد

| | |
|---|---|
| شابک | : ۹۷۸-۹۶٤-۷۹۷۰-۹۸-۳ |
| شماره کتابشناسی ملی | : ٤٤٤۷۲٤۷ |
| عنوان و نام پدیدآور | : رامان: له خۆرەتاوی تیکەلاو بە هەورە داخزیوەکانی سەرقژ و بەژنی چیا!!/ نووسەر سەیدئەحمەد حەسەنیفەرد. |
| مشخصات نشر | : مهاباد: هیوا ۱۳۹۵. |
| مشخصات ظاهری | : ۱۳۲ ص. |
| یادداشت | : کردی. |
| عنوان دیگر | : له خۆرەتاوی تیکەلاو بە هەورە داخزیوەکانی سەرقژ و بەژنی چیا!!. |
| موضوع | : شعر مهابادی — قرن ۱٤ |
| موضوع | : Mahabadi poetry — ۲۰th century |
| موضوع | : شعر کردی — قرن ۱٤ |
| موضوع | : Kurdish poetry — ۲۰th century |
| رده بندی دیویی | : ۹/۱۲ فا۸ |
| رده بندی کنگره | : ۱۳۹۵ ۵ح۸٤۳م/ PIR۳۲۵٦ |
| سرشناسه | : حسنیفرد، سیداحمد، ۱۳۱۹ - |
| وضعیت فهرست نویسی | : فیپا |

نێوی کتێب: رامـــان

لەتیشکی تێکەڵاو

بە هەورە داخزیوەکانی

سەر قژ و چیا!!

نووسەر: سەید ئەحمەد حەسەنیفەرد

ناشر: انتشارات هیوا

بەرپەندی و ڕووبەرگ: ئاوات حەکیمزادە

بەرگەژمێر: ۱۰۰۰

ساڵی چاپ: بەهاری ۱۳۹۶

# پێرست

ا

# پێشەکی

زانستی رۆژ باڵاتر لەوە بووە: کە من توانیبێتم ئامانجەکانم بە رێک و پێکی بپێکم!! بەڵام وێ دەچێ چەند تیرێکم بە هەڵە لە کەوان نەترازابێ؟

هەر بۆیە دوای ماوەیەک لە بەدوادا رۆیشتنی هێڵە ناهەموارەکانی ژیان، زۆرم پێ نابەدڵ نەبوو وەک هاواڵێک بۆ دڵی تەنیام، بەلاوێنی پەخشان دەوری چەند دانەیەک لەپۆلی رەوەک و چیایی مەلی شێعر بتەنم کەئەگەر پەلەوەرێکن دڵ بزوێن، با بازرە نەبن، ئەگەر دزێویشن، با تەیمانەی پەخشان بیانشارێتەوە.

نایشزانم چۆنم کەوی کردوون!؟

دیارە بەشێکی زۆر لەبەرهەمی وڵاتی ئێمە وەک دێمەکارێک بە بارانی هات و نەهات شین بوون و خەت و شوێن و کەردوویان بۆ نەکێشراوە.

رەنگە هەر وایش بێ، لە زۆر شوێن دا تەڕەکاری پێستانە دێم گەلێک بەتام و لەزەت تر بووە لە ئی بەراوی یەکجار بەرێ و جێیش.

بەڵێ: خوداپێداوەکان لە کاتی موتاڵا دا کە گەیشتنە هەر مەتڵەبێکی نوێ، لە فیشی چەند دێڕی دا بە تەرتیبی ئەلف و بێ

رایان دەگرن و لە کاتی خۆی دا بۆ مەبەستی پێویستیان تەنانەت لە شێعریش دا کە نیازی بە زانینی فەلسەفەی رۆژە، بەهرەیان لێ وەردەگرن.

با چار و بارە دەرە دزەیەکیش بەرەو ئەدەبی هەندەران کرابێ، بەڵام ئاواتی منی دەست پەروەردەی هەرێمێکی رانەهاتوو بەو شێوەکارە، هەر ئەوە بووە کە بەرهەمی کەمی بێستانە دێمەکەم، بۆخۆم و بۆ رێبوارانی باریکە رێی بەر ئەو دێمـەکارە ببێتە بەهرەیەک، بێ ئەوەی بچینە رنینەوەی .....

دنیای روونی من لە چاو هەڵێنانەوە کە ٢٥ گەلاوێژی ساڵی ١٣١٩ی کۆچی هەتاوی بەرامبەر بە ساڵی ١٩٣٩ی زایینییە تا ئێستا موکریان بووە، تەنیا چوار ساڵێک لە زانکۆ تاران کۆمەڵناسیم خوێندووە و گەڕاومەتەوە ئەو دەڤەرەی کە بە وەیشوومەی زستانیشیەوە هەر وەرزێکی بە هەوێنی سروەی بەهاران رەنگی گرتووە و بۆتە رووگەی دڵ بە کوڵان.

جا رەنگە ئەو هێزەی کە دڵ دەیلێ، شاباڵی خامە نەیبووبێ، بەڵام ئەگەر لە سەر کانیاوی بەر دارەبەنێکی لێرەواری وڵاتەکەم، کۆشکێک، چل چرایەک، هەروەها قافیەی شێعریشم لە تاڵ بە تاڵی بسکی دلدارێکی دەسکردی خەیاڵ ساز کردبێ، بۆ ئەوە بووە تا بڵێم: منیش لە بیت و بەرەکەتی هەرێمێکی ئاوا بزوێن بێ بەش نەبووم.

دیارە ئەم چەند خاڵەش لەم کورتە نووسراوە دا لە بەر چاو گیراون،

١- بەشی زۆری شایی و زەماوەندی کوردەواری دەکەوتنە بەر سارد و سەرما و بە گۆرانی و سەربەندی «پاییزە لە من و درەنگە لە تۆ» دەست پێ دەکران.

ئێستایش ئەگەر بمانەوێ دیلان گێڕی بووکی شێعر بین، بۆ ئەوەی لە تەف و لەرزی سەرما و سەخڵەتیی بپارێزین، نە تەنیا کراسی ناسک و تەنکی ئەدەب، دەبێ بە سەرپۆشی گەرمی فەلسەفی، مێژوویی و کۆمەڵایەتیش بیڕازێنینەوە.

******

٢- شێعری ئەمڕۆ ماڵێکن ئازاد، چریکەیان هان دەری هەست و ئیحساسە، بەرەو ژینێکی بێ خەوش و ساکار.

با شێعر خنکاوی بەحری مەزید و نایرە و داکراوی بەندی ریدف و قەید و قافیە نەبێ، بەڵام هێندێک لە شێعری ئەمڕۆ پەخشانی ئەوەندەش نەخشین، کە زمان لاڵ دەبێ بڵێ: وەزنیش دەورێکی بەرزی بزوێنی هەیە

با هەودای ئەم لێکدانەوە نەخرێتە سەر خەرەکی بنەڕەتی هونەر کە لە دوا دانی دەوێ. بە کورتی زیاتر دوای وەرگێڕانی هونەری هەندەران بوو کە موغارەلە. پێ هەڵگوتن و بە بایەتی لاسایی کردنەوە لە کەمی داوە و شتی نوێ هاتۆتە ئاراوە،

شێعری ئەمڕۆ هەتوانی دەرد و برینێ، ئاهەنگی شادین، پرد و رێبازی جم و جوولی کۆمەڵایەتین و دەبێ لەو بەری ناسکی دا، سندانی سەر دڵی بێ بەرەییانیش بن.

بەڵێ: لە ئامێزی خاتوونی خەیاڵ دا، شێعرێکی کاڵ بە دارە دارە و سەر و لاجانگ داهێنان وەگڕ و گاڵ دەکەوێ، پێ دەگرێ و حۆ دەنوێنێ. شانازیی خاوەن خەیالیش ئەمڕۆ ئەوەیە کە کورپەیەکی بە بەهرەی بار هێناوە بۆ داهاتووی زێدەکەی.

شاملوو دەڵێ:

موضوع شعر شاعر پیشین از زندگی نبود.

......

......

در دام گیس مضحک معشوقه یایند

حال انکه دیگران

دستی به جام باده و دستی به زلف یار

مستانه در زمین خدا نعره می زدند.

بە داخەوە ئێستایش هێندێک لە ئەدیبانمان هەر... .

❊❊❊❊❊

٣ ئەوا سەدەی بیستەمیش ماڵاوایی لێ کردین و هێشتا هەرێمی ئێمە لەگەڵ تیکنۆلۆژی دا برایەتی پێ نەبەستراوە. هەر بۆیە بۆ بزواندنی چەرخی ئابووری و گەش بوونەوەی خوێنی ناو دەمار و وردە رەگەکانی ئەندامی کۆمەڵیش دەبێ پێوەندیمان بە فۆلکلۆر و وێژەی رەسەنی وڵاتەکەیشمانەوە بێ، نە نەنیا لاسایی کردنەوەیەکی ئاشکرا و بەرچاو، تا نەبێتە هۆی تێک چوونی کۆشکی ئەدەبی ئەمڕۆمان.

❊❊❊❊❊

٤- زیاتر ناوەرۆکی کۆشکە کە میوان دەحەسێنێتەوە و خانە خوێش سەربڵند دەکا. دیارە هەتا وبست و مەبەست بە هەستی ناسک و ئیما و ئاماژە دەر نەکەوێ، ناڵێن شیعرە.

کە وایێ تۆش لە تەک منا بێژە:

- داد لە دەست شێعری زۆر و بۆری بەشێکی زۆر لە شاعیرانمان. با شێعری حەماسی و مێژوویی نەگرێتەوە، نەوەک چۆک لە ژێر باری نانووت دا بفیزێ.

ئەوەی راست بێ لە دیوانی شاعیرە مەزنەکانیش دا، زیاتر لە چەند پارچە شێعر ناکەونە بەر چاو و وەجاخی دڵیان جوان پێ ناگەشێتەوە.

******

٥- بێ لێک دانەوە و هەڵسەنگاندن، لێک هەڵاواردنی واژەی وەک یەکی دو زمانی هاوریشە گەلێک نارەوایە. بۆ وێنە:

ئەگەر واژەگەلێکی وەک: گەردوون دەروون کۆشک نیگا نیگار- بەهرە-سەرسەرا- بارەگا- سادە- سروشت- شەیدا- واژە و ... لە کوردی دەراوێژین، ئەی بۆ ئەم واژانەی وەک: کەم- زیاد- سەر- موو- ریش- دەست- پا- ران- گەردن- گەرما- سەرما- نەرم- زبر- باریک درشت بەهار پاییز زستان ساڵ رۆژ- شەو- پیر- جوان- چەپ- راست- ماست- کەشک- پەنیر- شیر یان بۆ ژمارە و رەقەم لە یەکەوە تا هەزار، میلیۆن دەبێ چ بێژین؟

بەتەوەیەکی دراوسێ نین کە لە زمان و کەلەپووری یەکتر بەهرە وەر نەگرن. ئێمەش تا رادەیەکی زۆر لە واژەی بێگانە خۆ دەپارێزین. تەنانەت هێندێک لە واژەکانی خۆمانیش بە فارسی لە قەڵەم دەدەین. دیارە زمانەکەمان، زمانێکیش نیە وەک فارسی کە بە بێ واژەی

عەرەب ببێتە بەلەمێکی شەق و شڕ. بەڵام هێندێک جار واژەی بێگانە رستە و وتار بە بڕست تر دەکەن و ئەگەر "هاردان بیر" وەریان گرین، رەنگە زیانی نەبێ.

******

٦- هەڵسەنگاندنی هەر بەشێک لە هونەر یا بە شێوەیەک بێ کە خاوەنەکەی لە هەر چی هونەرە بازرە نەکا. گەلێک جار کاری لاوێکی شایی بەخۆیان بە دەردێک بردووە، کورد گوتەنی:

دەوارە شڕەی لێ قەوماوانیش بە دەست باوە بەو مەرەدە نەچووبێ.

یا تەقد نەکرێتە لێکدانەوەی خەونەکەی هارۆون[1] و مەرگی هونەری کابرا نەبێتە پێش چاوی و وردە ئیرادەکانی ئەوەندە گەورە نەکرێنەوە کە لە هەر چی تەقد کەری دنیایە بێزار بێ.

******

٧- بەرەبەرووی کراسی باسەکە بەوە داکوژێنین کە نەبیسراوە بڵێین: کارێکی هونەری چەند شەو و رۆژی گرتووە، تەنیا دەگوترێ: جوانە و دەستی هونەرمەندەکەی خۆش، یان ...

چەند بەندێکی لە ژمارە ٥٦ی گۆڤاری مهاباد دا چاپ کراوە

******

[1] دەڵێن هارۆون خەونێک دەبینێ. لە زانایەک دەپرسێ کە خەونەکەی بۆ لێکداتەوە. کابرا دەڵێ قوربان وا دیارە ئەو خزمانەی کە ئائێستا لە گەڵتن، هەموو لە پێش تو دا دەمرن، هارۆون دەستووری گرتنی دەدا. یەکی تری بۆ بانگ دەکەن. ئەمیان دەڵێ گەورەم، مەبەست لەو خزمانەی کە ئائێستا لە گەڵتن، لە هەموان درێژتر دەژی. هارۆون دەڵێ خەڵاتی کەن. دیارە هەردوک یەک وڵام بوون بەڵام ...

# بەشی یەک

- هێنانی گڕ
- بێ سنووری
- رازێکی نەشەمزاو
- پرسیار
- شەوانە
- باوەڕ و سام
- کام سەدە
- ئامازە
- زەبری نزا

*ئەوەی کە هەن نە بە پێی کات و ساتی نووسینیان، هەروا، کرانە چەند بەشی کورتی بە رەنگ لێک نزیک و رەنگە هیندێکیان هەر یەکتریش نەگرنەوە.*

# هێنانی گڕ

چوومەتە بارەگای هەتاو
هێناومە ماشەری گڕ و
تیشکی ئەوینە رایەڵم
مەترسە، ما
نەرم و نیانی باوەشی گوڵ و گیا
سێبەری ترسنە
- دژ بە ژین -
بە ژێو کەوانی ئایرین
پێکاومە وا
هەتا هەتایە نەیکرێ
هەنگاوی وەسوەسەی رەشی
بنێتە ناو کەژ و چیا.



لە گۆڤاری زمارە ٩٧ی مهاباد دا چاپ کراوە.

## بێ سنووری

کە دەستی زێوینی فەلەق
دوا چەپەری تاریکە شەو پێوەدەنێ
چ سەیرە رازی ئەو گوڵەی
بە پرچی ئاڵۆزی هەتاو
پێدەکەنێ و
بارە کەوی بەر رەوەزێکی سەرتریش
بە تێپەڕینی سێبەری بەرزەفڕێک رادەچەنێ !!
ئەمجار
بە ودمی سروەیەک
کە رووحە بۆ کەژ و چیا
ببێنە دیلانی گوڵان
بە دەوری ئاوی کانی یا
ئیلهامە بۆ ئاهەنگی ژین
لە هەرمانی
بێ سنووری
نەمانی یا.

✪✪✪

# رازێکی نەشەمزاو

ئاواتی من
کە هەر وەها سەر بە مۆرن
چرۆی داری ئەوینێکی
روو بە تاڤگەی بەرزی خۆرن
نەپشکوونووی
سەر ترۆپکی چیاکانن
لێکدانەوەی بەساڵاچووی
مەبەستی مێژووی ژیانن
کە پێم وایە:
خشڵی بەرگی پەریی نامووسی ئینسانن

..........

ئەمن مەژنی بەربی ژینم
لە داوێنی هەرارای
سەر
هەورامانی پیرشالیاری مەزن دبون
هەژبنێکن
لە گەڵ هەنیسکی هەتاوا
لە خوربەی خەو راپەڕیون

هەتا رابوون

هەزاران جار

فرمێسکی سوێر و شیرنم

بە سەریانا داوەریون

بەهادارن

بە توانەوەی عومری رابردووم کڕیون

..........

من پێم وایە

لە بنیاتا

رەگەزی خۆی نەناسیوە

ئەوەی

خەونی بۆ خەونەکانی من دیوە!!

..........

جا چۆن دەبێ

هەوری ماتەم

لە سەر بان و گوێ سوانەکەی کەپری ژینم

بگرمێنی

منیش بێلم دڵۆپەی شەو

حەریری

سەر شان و ملی پەریی ژینم

بڕاکێنێ!!

یان بهێلم

تەوژمی مۆتەی نیوەشەو

ئارەزووی بەرز و پیرۆزی

چەندین ساڵەی زێد و هۆزم

بتارێنی!!!

...........

ئەرخەیانم

ئاواتی من نەشەمزاون

سەر بە مۆرن

چرۆی داری ئەوینیکی

روو بە تاڤگەی بەرزی خۆرن



لە ژمارە ٨٠ی گۆڤاری مهاباد دا، بڵاو بۆتەوە

## پرسیار



لە دەروونی بەندیخانەی بیر و راتا
وت و وێژە
سکالایە
بە کوڵ، بە سۆ.
چاوی کزت
هەنگاوی بێ هێزو شلت
بە ئاهەنگی
لەرینەوەی تەلی تاری زامی دڵت
هاوار ئەکەن:
کە «ئای گەلۆ»
چەرخ و خولی گەردوونی دوون
بۆ وایە، بۆ؟!

٭٭٭

کارەساتی سیحری خامە
لەگەل
کزیی رەوتی مێژوو

نەمانزانی
چیی پێ کرا و، دەوری چ بوو ؟!
هەر بۆیە
هاوڕێ بووی لەگەڵ
داسنی یەکانی یەزدانی:
کە
«هەرمن»
حێوی نەزانی
حێوی دڕک و بەردەڵانی.
بڵێی
هەروا زاڵ بێ لە سەر
هۆرەی پاکی
هۆرەی جوانی
هۆرەی چیا و سەوزەڵانی ؟

۞۞۞

دیارە بۆیە تۆ پێت وایە
بۆ ئەو هەرێمەی
کە.هەر وا
بێ برستن لەم دنیایە

بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتی ڕۆژ لێ گیراو
ببوورن
ڕۆژ لێ ون کراوا!
بێدەنگی یەک
بە هەیبەتی دەریایەکی مەندو هەراو
بێدەنگی‌یەک
لە زیوەری ڕووباری ڕوون تێژی کراو
بێدەنگی یەک...
بەم هیوایە
نەرم و بە سام وە خۆ کەوێ و بێتە کایە
وەک چۆن تکەی
فرمێسکی غاری ڕوو بە تەم
بە هێمنی دەهاتە سەر
سینەی لەشی
تەختە بەردی داستانەکەی "ئیبنو حەجەر".



شەکانەوەی
شەپۆلی هەوری ماتەمە!!
ئەی
برووسکەی بیرو بڕوا

بە بەر دەستێی چ دەستێکە

هەڵگیرساوە ؟

کە خۆرەتاو

دوورە پەرێزە

وەک سڵ بێ یان تاسا بێ

بە شەرمەوە لێی راماوە ؟



تا ئەو دەمەی کانگای ئەوین

خامەی بە هێزت پڕ نەکا

لە داهاتی نووکی قەڵەم

کانیاوی

بیر و باوەڕی گەلبشت،

بۆ سەر پڕ نەکا

خشڵەکەی روونی رووبارت

بەرەو دەریای بێ شەپۆلی، دیلی، داماو

تەنیا خەون و خەیاڵێکە!

ئاڵۆز دەبێ و وەدی نایە

دیارە دەریا

نەسرەوتنە

هەدا نەدانە

جمینە

دەهاژێت و نامۆیە بۆ

هەچی رژدو نالەبارو بێ بەهایە.



لە لاپەڕەی ٧ ٤ی گۆڤاری سروەی ژمارە ٥٩

جۆزەردانی ساڵی ١٣٧٠ دا چاپ کراوە

## شەوانە

شەو
کە، زێی زێوینی تیشکی مانگەشەو
دادەڕێژێ
دیمەنی دەریای بەرین
من پەڕەی کەشتیی خەیاڵ
دەسپێرمە دەست
شەوشنەی مەوجی بلاوێنی ئەوین
.....
شەو کە سرتە و هەستی
ناو قامیشەڵانی بەند و زەل
نایێتە گوێ،
من هومێدم
چەشنی تیرێژی هەتاو
دەچرم
لە گەل ئاهەنگی زین
.....

شەو کە دێتە دەربڕینی خەم
بە دەنگی بێ کەسێ،
من لە ئاسۆ ڕا
دەبینم
ڕادەموۆسێ بانی هاوسێکەم
هەتاوێکی بەتین.

.....

جا بە باڵا گرتنی ماتەم
ئەمن
دێنمە بەر نووری چرای چاو
دەنگی کۆخەی
مەرگی "بەند و کۆت و زنجیرم"
کە هاتوونە ڕزین،



* ئەوە وەرگێڕانێکە بە کەمە گۆڕینێکەوە لە شیعرێکی "شبانه"ی ئەحمەد شاملوو
کە لە ژمارە ١٧ی گۆڤاری مهاباد دا چاپ کراوە

## باوەڕە سام

ئەگەرهەنگاو هێندێک شلە !

دەڵێن:

کزیی ڕەوتی هەتاو

بەرەو ڕۆژاوا بوون کلە !

.......

بەیت و باڵۆرەن

بەوردی بە پەردەی گوێ دا دراون

بەرەی پەندیش

بۆ مژینی خوێنی غیرەت

لە سەر قسن و گۆڕخانەکان

ڕاخراون.

۞۞۞

دە توخوا

ساتێ کە ڕابوون

دەم و دەستێ
چیا ببڕن
تاوێری زل جالە بکەن
دارو دەوەن وەخۆ بخەن
ویشکەڵیش وا بەر گڕ بدەن
تا بەهاری کاسی خەوی لەمێژینەی
پێ هەڵستێ.

........
بە ڕێرەوانی شەو بڵێن:
هەوارگەیەک بدۆزنەوە
کە هەر پەرین دەچێ
لە بەر
ئەینووکی روونی کانی یا
قژی هەتاو دەهۆننەوە
لەو شوێنە هۆبە هەڵبدەن
هەتا
هەوێنێ خوێنی ژین هەیە
تەلەسمی شەو ئەبیننەوە



هەرچەندە با و بۆران رای دابیں و لە گێژاوی ژینا لە پێمەلەش کەوتبین، هەرگیز وەک ختکاوتک پەنابەری هەر کەنداوێک و پەلاماردەری هەر پڕ و پووشێک نەبووین، با تۆفانی نەگبەتیش هەستابێ‌اجار و بارەش پێمان وا بووە کە کۆلکە دارێک رەنگە بتوانێ لە گێژاومان بەرێتە دەر! بەڵام

## کام سەدە؟

باوەڕ مەکە تەنیا شەمێک
بۆ هەرێمی تـووک و نزا
بۆ ساتێکیش
هەڵکرا بێ !
یان
فەلسەفەی ژێر چنگی داڵی دەسەڵات
پەیامێکی ئاو روونکەرەی
بۆ سەرچاوە لێڵ کراوەکان هێنابێ
ئەتۆ بڵێی

خۆرەتاوی سڕ و تەزیوی ئەم سەدەیش
تین و تووشێکی پێ مابێ؟
یا خۆ کورە زێڕینەکەی[1]
لە گریانی لەمێژینەی راوەستابێ؟
پێت وانیە هەروا شەوە؟
بگرە تاریک و تنۆک تر
لە شەوگاری هەرە سیای سەدەی بیستەم؟
دیارە ئێمەی
هەرێمی رۆژ لێ ون کراوی سەر بە تەم
سالیانی سالە واین کە هەین
بە کام درۆ
کام دەلەسە
یان کام بەلێن باوەڕ بکەین؟
بلێی رۆژێک بۆ سکالا
بە عەرشی خۆرەتاو نەگەین؟
ئەمجارە بێین
دەرگای فەلسەفەی چەپەلی

---

١- نیو سەدەیەک لە مەوبەر لە ناوچەی موکریان. باو بوو کە منالسان کاتی هەور و هەلا هاواریان دەکرد:
ناوەکە وەرەوە، وەرەوە کورە زێڕینەکەت دەگری
نسێکە بڕووە، بڕۆوە کچە کەچەلەکەت دەگری.
کەچەلی لە ناو کچان دا زۆر کەم بوو، کەچی حەونی ناخۆشیان هەر بو کچ دەبینی!!

درۆ و دەلەسەی
ئەم سەدەیش قوڕ دا بدەین.

٭٭٭

٢٠٠٠ م - ١٢٧٩ هەتاوی

## ئامانژە

بەرزە فڕی گەر بتەوێ
سـنووری
ڕێچکە ڕژدەکەی مەکۆی دڵان
بۆ ژینی نوێ
بە ئامازەی نسێی شاباڵی لەنگەرت
وەدەرکەوێ.



## زەبری نزا

گوڵی ڕکەی ژوورەکان و  
گوڵی کێو  
گوڵی ناو دار و دەوەن  
گوڵ هەر جێی هەن  
بە کام گەروو هاوار دەکەن ؟  
ئەو کاتە وا  
لە دڕک و داڵ  
چڵ چڵە گوڵ بژار دەکەن ؟!

ooo

هاواری گوڵ  
ڕۆژ  
بە زەبرە  
ئاخ کە هەتا دێتە نزا  
چەند بە سەبرە!!!

# بەشی دووەم

- دوو بەیتییەک
- رازی تەلان
- ژین
- خەوڕەوێن
- کۆچ
- نیگایەک

## دوو بەیتییەک

عەیامێکە لە بەر شـــوعلەی شـــەمێکم
بە ئـــــاواتی ژیان تـــــــا سەردەمێکم
بگەینە سەر سنووری شـــــاری شادی
لەوێ هەڵکەم چرای چەند بەرهەمێکم

# رازی تەلان

لەگەڵ چلە ڕێواسی بەر چاڵە بەفرێک دەدوام، کە پۆلە هەورێکی ئاڵۆز و بە سام بـــە کرژی داخزیە سەر داوێنی تەلانێک و بە بارانەوە تێکەڵ بە تیشکی خۆرەتاو بوو، هەر پەڵە هەوریش بوون کە لە ژاڵانەوە دۆڵ و دەرەیان سەربەرەژێر دەپێواو پێیان وا بوو کە «پیـــرشـالـیار»ـەو رۆژە دا، نوێژەبارانەی بۆ وشکە ساڵیی ژاوەرۆ کردووە!

دەڵێن: لە شاهۆ را باز و شەهێن لەگەڵ پەلەوەری سەر تاشەبەردەکانی ئاتەشگا دەدوێن:

کە هیچ ڕوانینێک ناتوانێ بە قەڵەم یەک بە هەزاریش لە خۆر و بارانی هەوارەکانی شمشێر، یان هەیبەتی ئاوەکەی بڵ و سامناکی بەهارانی سیروان بخاتە بەر چاو.

هەر بۆیە رازی ڕوانگەی هەورامانم لە گەشتە پڕئاهەنگەکەی گۆرانا بە جێ هێشت و تا مەرزاییەکانی کەینێسی و بەردێزی نەگیرسامەوە کە زریانیش بەرەو باکوور برستی لە شاباڵ بڕیبوو!!

جا ئـــەگەر بە ســـووکە باڵـێک تا سەر چاوەکانی داڵانپەڕ و لەوێ وە بە گەڵاز و سپیرێز دا دوای لەنگەرێک لە سەر دەشتی لاجان و لەند و گردبەران، لابرێ ڕێم کەوتبێتە لێرەواری بەر

قەندیل و بە زێیەدا بەرەو هۆمل و داوێنی ئاو هەڵدێرەکانی کوتابێتم !

دوای پـــەڕینەوە و گەڕێک ڕەشبـەڵەک لەگەڵ بیزا کەرانی تۆرە و مەیدان چۆغە، بە نیازی چوونە « زرێوار» بۆ وەدەست خستنی رازی ئەو دەریایەی کە بە فرمێسکی بێنەوایەک شاری زوڵمی فەیلەقووسی تێدا ژێر بەرە ژوور بوو، رام دابێ! لە کانیاوەکانی سەرتوون و نجنە و داوێنی ئاربەبا توونیەتیم شکاندبێ!بە سەررەویش بە سەر شارا گەڕابێتمەوە گەردەنەی تە-تە و دوای سووکەنیگایەک لە کورمانگان و تاق وەسان بە دەشتە-کەی ماهیدەشتا دوور و نزیک عەتری دارخورمای فەسرم بە گوڵ و گیای بێ هاوتای ئیلام و دالاهووەوە هەڵمژتبێ!!

خۆم بە بەختەوەر زانیوە کە بەهەشتێکم بە سووک و هاسانی وە دەست خستووە و بوومەتە مەستی بادەیەک کە هەست بە سەربەرزی بکەم.

بە پرسیار لە پیرە مازوارەکانیش پێم وا بووە دەگەمە ئەو هەوارگە هەست بزوێنانەی ئەویندارانی چادر و چیغیان لێ هەڵداوە، کەبێ دەست و پێی دەستی سنوور بووم و هەر بە ئاواتیانەوە دەژیم.

○○○

## شریف

هیچ دەزانی دوور لە تۆی نەرم و نیا
بوومە شەیدای دیمەنی بەژنی چیا؟!
سیحری ئاوهەڵدێرە دڵمی ساندووە و
روح لەگەڵ زەوتی کەوا بۆی دەرچووە
........

زەردوما و رژدیی چڕ و هەڵدێر و لان
شوێنە بۆ دەنگدانەوەی دەنگی مەلان
مێشکی بێ مێشکی نەیاری دژ بە ژین
چۆن دەزانن رازی ئەم زۆزانە چین!!
لای ئەویندارانی هەوراز و نشێو
رەمزی هەرمانی ژیانە شاخ و کێو
.......

بارەگای بەرزی هونەر گەر دانرا
فەرشی حەورەنگی گوڵی لێ راخرا
جوانترین وێنەیشی کەوتە زێدەکەم
بۆیە شانازیی بە زێدی وا دەکەم
........

هـۆ پـەری هۆ گوڵ، ئـەرێ هۆ هێز و تین
بـەس نییـە رامـان لـە ئوقیـانووســی ژین؟
بۆ بـەسـاڵـاچووی لـە حـەفتایش تێپەڕیو
تـام و رەنـگ و بۆی گوڵـــان دەبنـە بژیو
تۆش وەرە و تیشـــکی نیگـات بـاوێژە دوور
دەرکـەوێ لێمـان بـەهەشـــتی بێ ســـنوور
لـەو مـەکـۆیـە پـڕ لـە راز و رەمـزە دا
لـەو چیـا پـڕسـاز و نـەغمـە و ســۆزە دا
وا بە شـەوبۆ و شـەشپەڕ و سوێسنە و چنوور
لێک دراون ئاڵ و واڵـا و کەسـک و ســوور
رەنـگ و روون، نـەخشـــن، نیگارن، دیمەنن
خشـڵــی ســەر بێخـە و بەرۆکی چیمەنن
شـــەنگـەبیزای شـۆخی وا شـــایی بـەخۆ
بۆتـە هـاوڕازی کـەمـا و گیـابـەنـد و لۆ
گـەر شـــلێری شـــەرمیش ســـەر دادەخـا
بۆ گوڵـــان ســفرەی دڵــی خۆی رادەخـا

........

ســـێبـەری بـەر دارکـرۆسـکی لیـرەوار
ئـاوی کـانـیـاوی بـە بـەردا بـێنـە خوار
لـێرەیـە مـن وا بـەدڵ دەشـــنێـمـەوە
قـەت بـە بـورکـانی فـەنـاش نـاتوێمـەوە

جامی دەستم ئاوی روونی کانی یە
مەستی ئەو بادەم هەوێنی جوانی یە
دڵ بە بێ پەروا لە رووخانی جەسەد
شاپەڕی خستۆتە سەر ئەوجی ئەبەد
بۆیە سەربەرزم بە بوونی ژینی پاک
وا بەرەو ئاسۆ دەڕۆم بێ ترس و باک



١٧ بەیبی لەژمارە ١٩ی گۆڤاری مهاباد دا بڵاو بۆتەوە.

## خەوبەرەوێن

هەر شنەی نەرمی بزەت جار جارە بزێوێ خەیاڵ
دڵ لە شەوگاری هەرێمی ماتەمیش دا دێتە حاڵ

دوای بزەی تۆ بوو کە شادی کەوتە دڵ بۆ زەمزەمەی
شێعری دڵداری بە راوێژێکی سادە و کرچ و کاڵ

خۆشە دڵ بفڕێ بە ئاهەنگی شەقەی شاباڵەکەی
نەک خەیاڵاوی لە چوارچێوەی قەفەس دا بگرێ باڵ



گەر بەهاری ژینە، وەرزی شادی یە، دەست گرتنە
بەفرەکەی عومری منیش کەوتۆتە بەر دەس بای شەماڵ

جا پەرێی جوانی ئەتۆ و بەرزیست بزەم لێ مەگرەوە
تا موتاڵای کەم هەموو ورد و درشتی خەتتو خاڵ

خۆ لە سەر رازی ئەوین پێ شێلی لۆمەی کەس نەبووم
چونکە دڵ دەڕوا بەرەو ئاسۆی ئەوینێکی زوڵاڵ

خەورەوێنیشم کزەی فێنکی شنەی ئازادی یە
بۆچ بزەی هەر وا نەبزوێنێ فڕی نەرمی خەیاڵ؟

ئەی وەکوو بووکی بەهەشتی خەوەکانم چی دەبێ
گەر بە تارا و دابی کۆنی کوردەواری بێتە ماڵ؟

بە یادی کاک سعید بازیار



لە ژمارە ٥ەی گۆڤاری مهاباد دا چاپ کراوە.

# کۆچ

پەریی شیعری پەڕیوەی سەر چڵووکان
بە دیمەن وەک نیگاری تازەبووکان
گزنگی نوور لە ڕۆژی رووی دەباری
بەسەر بەژنی گەڵا و کوڵمەی گوڵووکان
شکۆی بەژن و بەر و باڵای وەها بوو
لە چەشنی تەونی بەر دەستی خودا بوو
بە بڕوای ڕێڕەوانی شەو بە گشتی
پەیامی ڕۆژی سەربەستی لە لابوو

لە ئاسۆی بەرزی تاریکی بەزێنا
لەگەڵ رابوونی کەوبارو و شەهێنا
کەسێ نەیزانی! بۆ وا زوو بزر بوو
بە دنیایەک لەگەڵ قەول و بەڵێنا
مەل و گوڵ پڕ بەدڵ خوێناو دەگریان
لە دووی کۆچی پەریی شیعری وەها جوان
کە بۆ وا هەڵبڕا و تۆرا بە جاری؟!
بەرەو ڕژدی و چڕیی کۆساری هەرمان

خەواڵوو بووین لە جەنگەی خۆرهەڵاتا
کە تێپەڕ بوو بە سەر ئاسۆی وڵاتا
هەتا رابوون ئەما خۆی و پەیامی
کە بدرەوشێن لە ناو کۆڕی خەباتا
بە گفتی شیرنی سوێسنە و هەڵاڵان
کە رامابوون لە کاسیی کیژ و کاڵان
دەڵێن هەرگیز نییە باسێک، هەواڵێک
لە دوای کۆچی بە مانگان و بەساڵان

بڵێی رۆژێک پەژارەی دڵ بسڕابێ
لە ئاسۆ را هەواڵێکی وەها بێ
کە هەوری ماتەمی ئەم ئاو و خاکە
بە سروەی سوبحی ئازادی رەها بێ؟!
هەمیسان بێتەوە ئەو پەریە جوانە
کە سیلەی نیو نیگای شادیی دڵانە
لە خەو هەستان و رابوونێک ببینی
کە بۆ کۆچ کردنی نەبێ بەهانە



# نیگایەک

چاوەکەم

بۆ کەرەتێک

چاوی دڵت هەڵبێنە

دڵ

نیازی بە دەوایە،

بە بزەت بیدوێنە

هند غەوارەن

ئەوی پێم وابوو پەریی دڵدارن

دە وەرە

لەم دەڤەرەش دابێ ئەوین دابێنە

....

بۆ وەخۆ کەوتنەوەی باوی نەمامیم،

سا دەی

چت لە دەست دێ؟

دە کەرەم کە و کەرەمت بنوێنە

دەسەوستانە مەلی دڵ

لە هەرێمی خەم دا

بە نیگایەک

لە سیاچاڵی تەمی دەربێنە

.....

جا کە ئازادی

بوێرانە لە پەڕتووکی ژیان

لاپەڕەی ڕۆژی ڕەشی

لێ بکـــــەوە، بیدڕێنە

وەکوو مێژوونووسی بەکرێگیراو

مێژووی وەتەنی ئاهۆراش

بتکەدە و

دەستی هەچی خێوی بتە، بشکێنە



# بەشی سێ

## دوو بەیتییەک

ئەگــەر چارداخی ژینت وا تەنـــــیبێ
کە دەورەت گشت بە گوڵ چڵ چڵ چنیبێ
لەوە خۆشتـــر نییە بێ حــــاڵ و باڵێک
کە جــــارێکی بە خەندێکت خــــەنی بێ

*نازانم ناوەڕۆکی ئەو دووبەیتیەم لە کوێ وەرگرتووە؟*

## وره

لە وەتا هەم، دوور و نزیک رزانیومەتە رەوتی لەباری ژیان، ئەو ژیانەی کە لە داوێنی بزوێنی چیای ئاوات و ئارەزوو دا نەسرەوتنی بۆتە هەوێنی هەدانەدانم.

دیارە چیی پێ نەچووە کە بەرەو کەژ و چڕ و تەلان تەنیا شوێنی نستیی ژیانم پێواوە، ئەویشم لێ نەدیو بووە و خزیوەتە رەوەزێکی بە سامی ناو چیاکەوە!!

وا تاساوم تەنیا توانیومە روو بکەمە دار و دەوەنی چڕ و تەلانەکە بە نەمای ئاماژەیەک بۆ رەمزی کردنەوەی تەم و مژەکەی بەر هەڵستی سەرکەوتنم، کە خرمەی ژێر نەرمە هەنگاوی رێبواران و دەنگ دانەوەی چیا بۆتە ئیلهامێک:

کە هۆ رێبواری بڕست لێ بڕاوی بەر هەڵەمووتی روو بە شوورەی قەڵای نەسرەوتن! مەوێستە، سڕ مەبە و ببزوو، بێتوو بە ڕێچکە رژدە بەردەڵانیەکەی بەر شورە دا وەسەر کەوی. دەزانی کە چۆن مان و ژیان، تەنیا لە بەر هێزی ورەی بەشکۆ دا سەری تەسلیمیان دا نواندوە.

بەڵێ. ئیلهام سۆزێک بوو لە سازی سەر کەوتن، بۆیە ئێستایش نەمزانی واژەی حەسانەوە لە کام لاپەڕەی لەش دا لێک دراونەوە!

ئەوا دەیشبینم رۆژ نییە کۆترە ماریکەی سەر گوێسوانەی قەڵا کە، چیرۆکی کۆل بەدان بۆ هاواڵەکەی نەکاتە لاوک و منی بەرەو هەرمانیش بە بیستنی نەگەشێمەوە.



## بووژانەوە

*زانیوتە وا*
*گوڵی تەمەن*
*بە چیاوی بەر کەپرەکەت،دەڕوێنمەوە ؟*
*ئەی بۆچی چین و پەرچەمت*
*لەم وەرزە دا!*
*بە ئیحساسی ئەویندارێک*
*دەخوێنمەوە؟!*
*چون بە تەمام*
*لەبەر گڕی بزە و نیگات*
*خاکەلێوەی لێ تۆراوم، بدوێنمەوە*
*بەفری*
*پەسیوی سەر دڵی ساردو سڕیش*
*بە هەڵکرانی ئاوری نەورۆزێکی نیشتمانم*
*بتوێنمەوە.*



*ئاگرە گەش و سوورەکەی نەورۆز، با هەر رەردی بەڕێنی دوای*
*سەرما و سوڵی زستانی دزێو با و نەکرابا بە دووکەڵی بۆگەنی لاستیک و جیرە سووتاو!*

# بێ ناو

به یادی کاک حەسەنی مام قادرم

ئەگەر بێ دەنگ و بێ هەستم
ئەگەرلاواز و بێ هێزە
نەمامی شێعری بەردەستم
ئەگەر هەروا
بەرەو زەرد هەڵگەڕان دەڕوا
چرۆی داری ورە و هەستم !
بە هێزی دەستی ئیعجازت
دەبێ هەستم
بڕۆم
هیند سەر کەوم
سەرتر لە بەرزایی سەری قەندیل
کە سۆزی نزمی ناڵەی دڵ
بە بەرزیی
عەرشی ئاهۆرا
ببێتە شێعر و هەڵبەستم.



لە ژمارە ٦٤ی گۆڤاری مهاباد دا چاپ کراوە

## ئاواتێک

کە ئاوردووی
دارستانی شێعری تازە و کۆنی گەلم
بە سەر یەکا کۆ کردەوە
بە گڕی دەستەچیلەی غەزەلێک
بوون بە ئاگر
بۆ وەجاخی لەمێژینەی کوژاوەوە
لە خەونێکا
رووناکایی ئەم مەشخەڵەم
بە مزگێنی
بۆ زەردەشتی خاوەن وەجاخیش بردەوە.



لە لاپەڕەی ٦٨ی گۆڤاری سروەی ژمارە ٧١ی ساڵی ١٣٧١
لەگەڵ دوو پارچە شێعری جەلال مەلەکشا و مارف ئاغایی دا چاپ بووە.

# شاباڵی دڵ

من بە هەوای
پڕ بە گەرووی دەنگی مەل و
بۆنی جاترە کێویلەکان
دەشنێمەوە
دەبا بێنم
لە رووپەڕێکی قامووسی گوڵزارەکەت
چەند واژەیەک بکەم بە باڵ و
شاباڵیش
لە چەند بەندی کورتی شێعرێک جوێ کەمەوە
کە هەورە سەر بەخێرەکان
وەخۆ خەم و
زەوی و زاری
ئاواتە نیوەگیانەکانی
پێ نوێ کەمەوە.



لە گۆڤاری زمارە ٧٧ی مهاباد دا بلاو بۆتەوە

## پەلی ئاوات

بۆ شکاندنی شەقلی تاریکی
ئاخ کە توانیبام !
تەنیا شەمێکم
لەبەر پێی پەریی شێعری سەربەستی
داگیرساندباو
هۆدەی دەروونی رەش و قورماویم
بە جێ هێشتبا
بە ودمی هێزی نەرمە هەنگاویش
برم کردبا
تا لە سەر مێرگ و ئاو و کانیەک
ئاوات و
شێعر و خەونەکانیشم
یەک یەک ناشتبا.



# کەروێشکە

بە وێنە مەوجی ڕەنگی گوڵ
لە بەر مووری گژ و گیا
نەسرەوتنە
لە سەردەمی بوێری و هەرزەکاریا!
ئەو شێعرە وا
کە پێم وا بوو
شنەی نەرمی بێ پسانەوەی
گوڵپەڕشەیە*
بە نەرمەبای
داوێنی بەرتەسکی چیا



* ناوی ئەو جۆرە گەنمانەی کە چل-پەنجا ساڵ لەوە پێش لە موکریان دا بە برەو بوون و کەروێشکەکان لە هەر چی شێعرە دڵڕفێنتر بوو
وەک: بەهاروو - سمەوەز - گەنمە سەرداری - گەنمە مەلا - گەنمە ئومێد - قەندەهاری - گوڵپەڕشە - گوڵبەهاروو - گوڵڕووت و ..

## سپردن

شاسوار هەیە؟!
جڵەو شل کا و
بیر و بڕوای
بە زریانی
سەرسپردەی ڕەشەبای دزێو
بسپێرێ؟!
یان باخەوان
ژاراو بنێتە گوڵزار و
بڵێت:
ئەوا گوڵ دەدێرێ؟
دەی
بۆچی نابێ دارزێ!!؟
ئەو دەست و خامەی
کە وازە
بێ بەها کا و
بۆ ئەم و ئەوی بنێرێ!!؟

## کێ بوون؟

لە ئەنگوستەچاوی بێ ترووسکەی ڕۆژگارێکدا!!
بۆسەیەکیان
بۆ دەقەرە کۆست کەوتەکان
دادەناوە
ببوون بە مۆتەکەی ژیان!!
هونەرێک کۆن و بێ پێز با
بە پێ و پلە شلکۆلەکەی منالانی ئەو شوێنەیان
دەشێلاوە!
گوێگریشیان
داتەکاندبوون لە ئەوین!!
ئەوەی ئاهەنگی مەینەنە
دەبوو بە گەڕەلاوژەیەک
یەک بۆ یەکی گێڕاباوە!!!

ڕووداو
نابینیں بە بێ هۆ
تا نەزانین

خەست و خۆڵ بێ!!
زۆردار
هێزی سەرەکیە !!؟ و
پێستر لەوەشێ بە دواوە.

## ؟!!

کە شابالی
لە لەپی هەر شۆرەکاتێک خشاند
بە ڕواڵەت
کەویری کاکی بە کاکیی
دەکرد بە جام[1] !؟
گیانلەبەری سەر گۆی زەویش
خۆیان
لەو جامە دا دەنواند!!
.......
نە بیم وابێ
بێ شک دەڵێم:
لە هێلانەی جادوو ڕا هاتبوە فڕین!
کە بۆ ئێمەی بێ دەرەتان
تەنیا
نەگبەتی هەڵکڕاند!!!

---

1 ئاوێنە

## دووبەیتییەک

دڵم شاسواری ئاڵا راشەکێنە
کە پاشکۆی کەیلی پەیمان و بەڵێنە
رکێف کوت وا لە سەر ئەسپی خەیاڵی
بەرەو هۆبە و هەواری شەوبەزێنە

## چەند هەنگاو لە گەڵ
## د. ع. پەشێو و کاک ق. موئەیەدزادە

دەمێکە لە گەڵ بزەی سەر لێوانی کاک قاسمی موئەیەدزادە دا ئاشنام، بۆ من یەک لەو کەسانەیە کە دڵی تەنیام لە لای دەحەسێتەوە و بە نوکتە و قسە خۆشەکانی دەگەشێمەوە.

کەم کەس هەیە کە بتوانێ کەحێلی هونەر بەزین و بەرگی واژەی زێڕین، وەک ئەو ڕەزاسووکە برازێنێتەوە و جڵەویشی بۆ بەرمە غار و ڕمبازێن، لە دەست دا ئەوەندە نەرم بێ کە بە کەیفی خۆی رای بدا. بەڵام ئاخ بەرەو کوێ ؟

مەلی شێعر دەیباتە ناو کۆڕی دەرسی مەولانای ڕۆم یان بە بەند و داوەوە لە فەلسەفەی ئێگزیستانسیالیستیی سارتری دەهاڵێنێ !؟

لە ژمارەی ٦٣ی گۆڤاری مهاباد دا شێعرێکی دوور و درێژیم بە ناوی "سەفەرێکی بێبڕانەوە" چاوێکەوت، چەندجارێکم خوێندەوە و چوومە لای خۆیشی، هەرچی کردم ماشەرە ڕەنگبنەکەی ئەوەندە ئاڵۆز هەڵکرابوو کە گرێیەکیم بۆ نەکراوە، وەک: «ئەگەر نسێکەم لێ گەڕێ، لە قووڵایی هەڵتۆقینی ڕەشەچاڵی هەر بە تەنیا کلوویەکا، میلیۆن میلیون کاکەشانان

هەڵدەفوڵێنم»، «ئەگەر نسێکەم نەبوایە، لە بەر باران هەزار جاران بە هەورێک دا دەهاتمەوە »، «بەهار شین شین دەبێتەوە، هاوین ئازار، پاییز رووتی دەرۆێتەوە زستان بێداد »،« شا کلیلێک رەمزی قفڵی قافیەی بەیتێ بگۆڕێ، پەنجەرەیەک بە دەرکە دا بێتە ژووری و هەزار دەرکە بە پەنجەرە دا دەرباز بێ.»!!!

زۆریان لێ ورد بوومەوە، سەر و خوارم لێ گرتن، هەرچی کردم نە بۆم هاتنە پردێ و نە بۆم هاتنە رێبازێ !!

ئەو شێعرەی خوا لێ خوشبوو "نیما"م کەوتەوە بیر کە دەڵێ: میردامادی فەیلەسووف کە دەمرێ، پەریی پرسیار دەچێتە سەر گۆڕەکەی و بە « مَن رَبّک مَن؟ » دەیدوێنێ، لە وەڵامیشدا شتی سەیر و حیکمەتی وەک: ئوستوقوسسیت و ئوستوقوسسات ئەبێ لێی نابیسێ، تێی ناگا و دەچێتەوە لای باری تەعالا و ئەویش دەڵێ:

« تو بدین بنده من حرف نزن
او در آن عالم هم زنده که بود
حرفها زد که نفهمیدم من. »

وا دیارە کاک قاسمیش شوورەیەکی وەهای بە دەوری مانیژەکەی داکێشاوە کە دەیەوێ لە هونەری بڕناو و جلیت یاری دا هەر تەنیا خۆی خاوەنی ئەو رازە بێ کە دەیزانێ !

بیازم .بەرەنگار کردنی شێعری ئەم و ئەو لەگەڵ یەکا نییە، بە بڕوای من ئەوانەی کە لە هونەر دا خۆیان بە لێپرسراو دەزانن، لە

دەرخستنی شێعر و پەخشانیان دا وا بێ کە سووژە و بیر و باوەڕیان لە گرێ کوێرەی واژە و مانا دا نەشاردرێتەوە.

باوەڕ ناکەم گشـــت بەنـدەکانی شێعری "خەوەبەردینە"ی کاک سوارەی ئیلـخانیزادە بـە تەواوی بۆ کەس ساغ بووبێتەوە بەلام هەر بە تەنیا جارێک خوێندنەوە،لە ئاوی قەتیس ماوی بێدەرەتان و ئەو کانیاوانەی کە بە کەند و کۆسپ و لاڕێ دا بەرەو زێ یە و روو بە دەریای شارستانیەت بەڕێوەن، دنــیایەک لە ئیســتاتیک و دینامیکی کۆمــەلایـــەتی دەدەن بە دەســتەوە، با چـــەند رستەیەکیشی لە گۆماوی تەعقید دا خنکابن.

پێم وایە کەش و هەوای موغازەلە و بەند و داوی شێعری دوێنێ و هێندێک لە فەلسـەفە سەبر و سەمەرەکانی ئەمڕۆ، بۆ هەرێمی ئازارچێشتووی ئێمە نابنە چارەسازی گیر و گرفتەکانی ئابووری - رامیاری تیکنۆلۆژیکیمان.

ئەو هونەرە کاری خۆی دەکا کە برینی زووداوە دڵ تەزێنەکان، بە حەند ئاهەنگ، پیت و واژەی ساکار ساڕێژ بکا، لاو و پیر و رۆشنبیریش وەها بەرەو پێش هان بدا کە چەرخی مێژووی پێ دەور بگرێ.

دیارە رستەی وەک " سەرت شۆڕکە، ملت کەج کە " لە نەرمی و لەتافەت دا ناگەن بە رستەکانی شیعرێکی وەک:

«شەونم کە لە سەر رووی وەرەقی گوڵ دەدرەوشێ
عەینەن وەکوو قەتـرەی عــەرەقی رووومــەتی یارە

سوێسن بە زمانێکی تەڕ و تازە خەریکە
بۆ مەدح و سەنای سانیعی ئەم نەخش و نیگارە»

م. مەلا مارف کۆکەیی

بەڵام کاتێ کە هەببەتی بیر و هەستی شاعیرێکی ئەمڕۆی وەک پەشێو، ئا بەم شێوەی دەردێنێ:

« سەرت شۆڕ کە
ملت کەچ کە
چاو مەگێڕە بۆ ئەستێرە و ئاسمان و خوا
ئەوەی بستێک زەویی نەبێ
خوا و ئەستێرە و ئاسمانی کوا ؟ »

بەڕاستی بۆ ئەوانەی کە رووناکایی مانگ و ئەستێرەیان لێ دزرابێ، لە سەر زەویی زێدی خۆیان مێرگ و مێرغوزاریان بە رۆژی روون لێ ئادیار بێ. تەنیا ئەم شێوە هونەرەیە کە دەبێتە رێنوێنی هەست و باوەڕیان بەرەو ئاوێنەی ژینێک کە هەرمانی تیا دیار بێ.

ئەگەر باسی شێعری رۆژە، با چەند دێڕێک لەگەڵ شاعیر و کەشتیەوانی بەحری بیر و هەستی نەتەوایەتی بدوێین، لە یەکێک لە وانە بە نرخەکانی دا دەڵێ:

« ئێمە تووشی سەد کوێرە رێین
چرای بیرمان گەلێک کزە
هەنگاوی کوێرانە دەنێین. »

بەڵێ:

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و کێ بێ بە تەواوی تاقەتی بە گژەبای جم و جووڵی کۆمەڵایەتی بشکێ ؟

بە خۆمان نیە کە لە گێژەڵووکەی چاوکوێرکەرەی رامیاری دا کەمە گۆڕانێکی بیر و باوەڕ دێتە پێش و ئاشاردرێتەوە.

هونەر ئەوەیە کە خونچەی دڵمان تەنیا بە شنەی شادیی هۆزەکەمان بکرێتەوە.

هێندێک جار و لە هێندێک جێیش رەنگە جنێو بە ئیراد نەگیرێ. بەڵام بە داخەوە زیاتر هەر قەزای گۆزە لە دیزە کەوتن بووە و لە جیات ئەوە کە پلاری جنێو بەر تاوانبار بکەوێ، دایک و باوکی بێ تاوان بوون کە تەقاونەوە و بەراو کراون.

ئاشکرایە کە بەشێکی زۆر لە رووداوەکان، لە ناو هۆڵی نارەسەنی بانکدارانی جیهانی دا شکڵ دەگرن.دەسەڵاتێکی زۆریش لە دەست دەستێنن.

لە خاکێکی بەر بڵاو و لەت و پەت و پڕ لە شوێنەونکەش دا، پێشڕەوانی رامیاریمان کە بە چڕ و لێژێکی بەردەڵانی و لارێیەکی پڕ لە مەترسی دائێدەبەڕن، چۆن دەتوانن، تا دوابین هەنگاو بۆ سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج، بێ هەڵە بن !؟

من پێم وایە هۆی "دانانی هەنگاوی کوێرانە " هێندێک روونە و کەمتر خەتا لە خۆمانە، دەجا وەک چۆن بە وانە جوانەکانی ئەو شاعیرە بەرێزە بوو، کە منالانی دوێنێ، ئالای ورە و ئازایەتیان،

ئەمڕۆ دە لەڕێتەوە، ئێستاش پێویستیان بە وانەی بە هێزترە و با پیر و گەورەکانیش بگرێتەوە، تا بتوانن لە گێژاوی رامیاری ئەم چەرخە دا، بەرەی خۆیان بە نەدڕاوی پێ بێتە دەرێ.



لە لاپەرەی ٢ ئی گوڤاری ژمارە ٥ ٦مهاباد دا چاپ بووە.

## پاشکۆ

قەوارەیەک کە بۆ بەرگی رەخنە بە بالای شیعرێک برابوو. بەشیکی کرا بە کراسی پەخسانیک وەک" چەند هەنگاو لەگەڵ..." ئەم بەشەیشی بە بەدووراوی و کەمیک لیبرین و میکردنەوە وەک خۆی بەما، لە ئەنر و مەسو بێ بێر کرا و بوو بە بارێک تیراد لە سەر ئەستۆی حۆم و کفێکیش بۆ نارمایی:

## مەرگ و ژین

لە داوێنی

چڕ و تەلانە کۆیلەکەی

ئاو بەندی

هەورێکی نەزۆک

گوڵزارێکە بێ‌رەنگ و بۆ !

دارستانی

بە رواڵەت دەریان داوە گەڵاو چرۆ !!

چ وەرزێکە ؟

کیژۆلەکان بۆ دەسکەنە و

کوڕو کاڵیش

دەڕۆن بۆ درونەنەی درۆ؟!!

....

ڕێبوارێکم
حەسانەوەم مەرگ و ژینە !
ڕاستەڕێی ناو خەونەکانی شاری دڵیش
هەوراز و نشێو بڕینە !
....
سەدان سەدەیش کە تێپەڕێ
لە گەڵ پیتی
شین بوونەوەی بەردی بنچینەی ژینەکەم
دیمەنی خۆم
لە ناو گۆمی وشک و تەڕی
سەر ئاگری بادە و شەڕاب
دەردێنمەوە
لە سەرداتی ئۆقیانووسە بێ ئاوەکەی
بەر هەیوانی
قەڵای دووری کۆنە مێژوو
سینەرێکیش
لە وێنەکەم دەنوێنمەوە !
دەچم
لە ئیبلیس دەپرسم:
بۆ دەرباز بوو

لە داناتی سەنگ و خشتی
مزگەوتەکەی هەرێمی نوور ؟!
بۆ چی
دلی هەڵدەقرچا
بە وەیشوومەی ناو ئاگری بەحریکی سوور !؟
....
دەی با لە ئێوەش بپرسم
بۆ نابینن
هۆرەی داری بیری شێتێک
کێوی
قامی فەیلەسووفێک
لە بن بێنێ ؟!
دێوی رەشی داخ و کەسەر
هەچی هەسێە
بە رووخانی قەڵای فەلسەفە
بمرێنێ !؟
....
گوێتان داوەتە ئاهەنگی
گریان و ناڵەی رەوەیەک؟
سەر قافڵەیان
ئی هەزارەی پێش مامووتە و

رۆرۆیەتی
بۆ ڕووخانی کۆشکی کۆنە خەونەکانی !!
ئەی نەتان دی
مەلێکی ورد قوتاری کا
قووتی خۆی و کۆچەکە وردیلەکانی ؟!
راز و رەمزی لۆکە پیرەم
لە هەر لایێ کە پرسیوە
لاڵ و سڕ بوون
نەیانزانی !
نەیانزانی !
....
ئاخ بۆ ئێوە کە نەتاندی
مێروولەیەک
بۆ قاوەڵتوون
چۆن هژدیهای کەول دەکرد !!؟
دەسگیرانە
قەد و باڵا چەند گەزەکەی
بۆ هەتوانی لە چاو نەچوون !!
چەند ملوانکەی مووروەشینەی
لە مل دەکرد ؟!!!
....

خۆزگە زانیبامان

هەتاو

کەی سێبەری خۆی را دەخا !؟

کەی ماندووێک

بۆ فێنکایی و حەسانەوە

لە بەر کوورەی نێلدراوی ئاسنگەرێک

پشوو دەدا ؟!

ئاخ و سەد ئاخ

نەمانزانی

کە چۆن ! کە چۆن !؟



لە ژمارە ٦٦ی گۆڤاری مهاباد دا

لە سەر وبستی کاک عەزیز وەلیانی چاپ کراوە.



نە لە عیرفان دەگەم، بە رازی دەربام کە نەزانی ! خەیاڵیش جێ
هەواری دڵدارانی پێ نەدۆزراوە. بۆیە
ئەم بەشە تەنیا بۆ تاراندنی تارماییێن لە دڵی مەنیا و لەوە زیاتریش
هەر هیچم لێیان نەوبستووە، یا ئەوەشیان لە دەست نەهاتبێ !



# سامان

مەڕوانە تیشکی تێکەڵاو
بە هەورە داخزیوەکانی سەر قژ و بەژنی چیا
دەهەستەدەی،
مەوێستە، رامەمێنە،
با
لەبەر گەرووی
کانیەکی دەورە داگەڕاو
لە سوورە گوڵ
سەرنج بدەینە هات و چۆی
ئاهۆرایی
چەند ئاسکی سڵ
ئەم جارە گوێ شل شل بکەین
بۆ زەمزەمەی ئاهەنگی دڵ.

☼☼☼

# تاڵانی دڵ

هۆ شەنگە بێری
رازداری سرنەی
سوێسن و وەنەوشەی شۆخ و دەستەملان
خاڵە جوانەکەی سەر حونچەی دەمت
شاراوەی شەوی بسکی پەرێشان
لە بەر شەبۆلی
تیشکی رۆژی رووت
ئەمن و ئیمانم
وەها خۆی نواند
تەڵەسمی ترسی شەوارە* بوونی
بۆ تاڵانی دڵ
بە جارێ شکاند
ئەو کەمەی مابووم لە عەشقی پیرۆز
تا بە خۆم زانی
ئەویشی رفاند.

*بە هەڵکراوی پارچەمان لە دەوری چرابەکی بە شۆق و رووناک دەهاڵاند و بە تاریکە شەو دەچووینە دۆڵ و دەرەیەکی پڕ لە باڵندە، هەر پارچە لە چرا دەکراوە پەلەوەر کوێر دەبوون و چاویان بە شەوارە دەکەوت و هێندێکیان بە دەست دەگیران

## تەونی ...

چڵ چرا و هۆدەی دڵی مـن؟
ئـەی هـەوێنی خوێـنی مانم
سۆی تروسکەی چاوەکانت
روون تـرن لـە چرای دیوانم



سڵ مەبە سـاتی ویسالت
نامـەوێ بـازار و بەهــرەم
پێشکـەشی بەژنی نەمامت
سـەر جەمـی کـاڵای دوکانم



گــەر هـەنـاری داری بـاڵات
لێک دەدەن میسراعی سەبرم
سانی بسـک و خاڵ و گۆنات
قافیــەن بۆ شێعرەکــانــم



چم لە ڕێ و ڕەوتی غـەزاڵ و
بـاغ و پـێ دەشتی بەهەشـتم
بێتو ئاسـکی مـێرغـوزارت
بـێـتە بـەر سـیرەی کەوانـم



گشـــتی ئـــاڵـــۆز و بڵـــۆزە
ڕایـەڵ و پـۆی بیـر و هەستم
تۆ بڵێـــی ڕۆژێـک بە دەستت
بێـــتە کر، تـەونی ژیـــانم؟

## تیری ئاگرین

نـەورۆزە ئەی تۆ
بۆح قـەوسی برۆت وا وێک هێناوە
برژانگت
بە پێی بەژنی ژێی کەوان
لە گـەڵ کێـشاوە
سـیرەت بگۆڕە لـە پـەردەی دڵـم
بزانـە ئاخـۆ
تیری نیو نیگات دوای هەزاران جار
کوێی نەپێکاوە؟



قەوس: ئاخر مانگی پایزشە.

## مەیکەدە

مـــەی و دەفری دەسی ساقی کە ئالــە
بـــە وێـــنەی ئاوی کۆســاڵان زوڵاڵــە

بە پیری سـەر چ بوو ؟ پـیری خەرابـات
کـە بادەی بەر دەسـی خۆی کرد حەواڵـە

وەهـــا شێـــوا بە مـــەی نەزمی ژیانــم
کـــە نازانــم، نــە رابردوو! نە حاڵـــە !

دەڵێن بەزمی مەی و مەعشووق و مەیگێڕ
بـە رێ و رەسمی ئەویندارانی حــــەڵاڵـە

دەجـا سـاقی ئەتـۆ و نام و مەزەی مــەی
بە مـەستیش هەر کـەرەم کە پیاڵە پیاڵە

هـــەتا بیمە کـــەویی بـەر مەیکەدەی تۆ

ژیـــــانم دوور لە باڵات پـــــێ بەتاڵـــە



---

1- [ بە – وە – دەڵێن – مەی – کە – دە ]
لە ئەوەڵی میسراعەکاندا هەن. هێندێکیان دووپاتیش بوونەوە.

٢ ئەم شێوە کارە بەتیا بۆ گوستنی کاتی وەرەری دەبێ

«نامرن ئەوانە وا لە دلی میللەتا ئەژین»
پیرەمێردی نەمر


وەفایی

وەفاییش کە لە مالاواییی یەکجاریی دا بە دەست ئەو سەر بەرزە لە لمی عەرەبستان دا دەنێژری،بەرامەی عەتری غەزەلەکانی تەلاری کۆڕ و کۆمەلی مۆسیقای کوردیی وەها داگرتووە کە بۆنی توندی گلەییی خەلکیان لە نەبوونی شیعری کۆمەلایەتی و مێژوویی، نەختالێک لێ دوور خستۆتەوە.

بێ سنوور شکاندن و کەوتنە ناو گێژاوی ئەدەبی هەندەران، بێ پەرینەوە لە خورێنایی بەر مالانی گوندەکەی گۆران و هێنانی چەپکە گولی بەر دەسرێژی خێلی دوژمنان. گەلێک جار بە ئەسپایی گۆشەیەک لە پەرژینی باغچەی ئەدەبی وەفاییم لاداوە، لە پەنا دێراوە ڕیحانەی یەکجار بە بەرامەو بۆن خۆش دا حەساومەوە و بۆ ماوەیەکیش مەست و کاسی کردووم.

ئەوگولزارەی کە وەفایی لە مەزرای دلداری دا پەروەردەی کردوە، شەختەی هیچ خەزانێک نەیتوانیوە و ناتوانێ گول بڕی بکا.

تێکۆشانی تەنیا بۆ غەملینی مێرگی لەش نەبوە و گولزاری شێعری لە هەواری دلان را پاراو بوون، بۆیە موعازەلە لەگەل نووری یەزدان دەکەن .

بەڵام وەک چۆن نالی، سوبر و نالیی لە خەمی خۆی و عالەم دا چێشتووە، وەفایی هاو چەرخ و هاو سەفەری حاجی تۆفیق بەگی تاریکی شکێنی شەوەزەنگی ئەوسەر دەمەش، کە چۆن بۆتە شەیدای بەر دەرک و دیوانی پەری و پەریزادان، با بە زمانی شێعریش، کە زمانی جم و جووڵی کۆمەڵایەتیی ئەو کاتە بووە، لە دەرد و مەرگ و دوا کەوتوویی وڵاتەکەی کەمێک دوابا !!

هەر نەبا لە چالاکیی پیر و مورشیدەکانی خۆی، چەند بەیتێکی بە سۆزی زەمزەمە کردباو ئێمەیش دەستمان بۆ داری بێ بەری بریا درێژ نەکردبا!

دەنا بەراستی وەفایی بەزمانی شێعر دواوە،وەک هەڵوەدایەکی دوای کۆچی دڵدار، لە سایەی نازی چاوبازێکەوە بۆتە رەندی خەرابات و حافز ئاسایی:

«لە لای پیری مەیخانە خەرقەی لە گرێو مەی ناوە»

بە بۆنەی دانـــەی خاڵـــەوە کەوتۆتە بەندی زولفێکی شێواوو شێتانە دەچریکێنێ:

«چ بکەم لە دڵی سەودایی پەریان دەستیان لێداوە»

ساتێ کە بسکی دڵدار بە باوەشێنی شاباڵی پەریان دێتە شنە، وەفاییش دەبێتە سەوداسەری سات و سەودای رامووسان و بە لێ تێک چوونی سەرکەوتووی سەوداکەش مەستانە تێی هەڵدەکا:

«لەسەر رووت کازیبەی زولفت وەلابە
کە ســـادق بـــێ تـــولـــوعـــی ئـــــاقتابە

دڵ و دین هــەر چی بوو قوربانی تــۆ بوو

هـــەتا کـەی ئیــدی ئـەم ناز و عیتابە

........................

........................

گوتـــم با قیـمەتی وەســڵت بـە دڵ بێ

بە ماچێــکیش لە زاری خــۆت رەزا بــە

کەچــی فەرمــووی دڵت نەشــکێ وەفایی

ئـەوە ســـەودایە زەرڕێــکیش حیســـابە»

شارەزایانی شاری شێعریش لێیان روونە کە وەفایی سەبک و زمانی تایبەت بەخۆی هەیە.

سوروشتیشە وەک هەمو شاعیرانی کۆنی رۆژهەڵات، دیوانی ئەویش، سێبەری دارستانی شێعری شاعیرانی پێش خۆی لەسەرە.

وەک لە دوو پارچە شێعری "مەستوورە" و "شیرین تەشی دەڕێسێ" دا نالیی نەمر بوێرانە تۆڵەستێنە لە والیی شار و مەستوورەی هاوسەری. وەفاییش وێنەی نەزمی فەلەکی لە چەرخ و خولی تەشیەکەی شیرین هەڵگرتووە و تەنیا شێوەی هات و چۆی مەکووکی دەستی نالیی لە تەنینی تەونی شێعری مەستوورەدا پێوە دیارە.

من پێم وایە لە پێچاڵی وەفایی دا ریس و هەودای تەشی ڕێسێکی وەک شیرین، کرا بە پۆپەشمینێکی نەخشین، کە ئەگەر

ڕەوا بێ دەستبکی ڕەنگین، چەند ئالێکی لێ دەراوێ، هەروا تۆرێک کەچایی لێ ببڕێ، پەراوێزی داگرێتەوە و بەدەستی وەستا کەمالی مەلاکەریمیش بە موعەڕڕەق دەربێ، لە مووزەی مێژووی ئەدەبی کوردەواری دا بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە.

لەو بەدەر کێیە بە شەو ڕۆژی لێ گیرابێ، لە دووی کۆچی پیری موغان بۆ کورتی تەمەن حەسرەت بخوا و بە ناکامیەوە دەنگ هەڵبڕێ:

«درێغا عومری شیرینم چ زوو هات و چ زوو ڕۆیی»

هەر بۆیە لەسەر دەستی پیرەمێردێکی سەر بەرزی کوردەواری دا پەیمان دەبەستێ هەر ئەوەندەی مۆڵەت لە تەمەن بوێ، تا لە دیداری دوبارەی دا گیانی شیرین بە تیشکی ڕووی دڵدار بسپێرێ و نەیێتە ئاخ هەڵکێشی دوای کۆچ و کۆچبار.

لە ژمارە ٦٧ی گۆڤاری مهاباد دا چاپ کراوە.

## لە پرسەی ئەمرێکی موکریانی دا

قەڵەم رەنگە جوان نەگەڕێ
وشەی تەرز و رێک و پێکیش
ئارا بن
زیز بن
فڕێ بن
هەڵاتبن بۆ سەر پەڕێ
بەڵام چ بکەم؟
ئەوینەکەم
شێت و شوورە و دێت بە شەڕێ
هانم دەدا
بۆ نووسینی دەربڕینی هەستی شێواو
ئۆقرە ناگرێ و لێ ناگەڕێ.

دیارە ئەمرێک بە رواڵەت مردووە و تەرمی پیرۆزی لە مهاباد ناشــتراوە، بـەڵـام یـادی پـاکی لە دڵـــی هەموو لاو و پیر و رۆشنبیرێکی وڵات دا جێگر بووە.

بۆیە پرسە، پرسەیەکی گشتی یە و تەنیا سەرە خۆشی شارێک یا بنەماڵەیەک نیە.

بۆ یادێک لەم سەربەرزە بێینە سەر لێکۆڵینەوەی نووسراوەکانی، دەزانین کە:

دوان لە پەخشانەکانی ئەو ڕێزدارە وەک "فەرهەنگ"، "مێژوو"، "شەرح" و "تەرجەمە" بەهۆی ناوەڕۆکی یەکجار پڕبایەخ و بەربڵاویانەوە، لە توانای کۆڕێکی گەورەی فەرهەنگی، زانیاری و ئەدەبی دایە، کارێکی وەها سووک و هاسان نیە کە تاقە فەردێک بتوانێ ئەو حەستەمە وە ئەستۆ بگرێ.

بەڵام گومان دەکەم بتوانین بە کەم و کوورییەوە لەبارەی شێعرەکانی مامۆستای هێژامان دا بەم چەشنە بیرو ڕا دەربڕین:

یەکێک لە شێعرە هەرە جوانەکانی "بەرەو موکریان"ە کە لە سەر خوانی زینی ئەسپی خەیاڵ، چالاکانە بست بە بستی زێدەکەی تا سەر سنووری نەمان پێواوە و سەرەنجام فریشتەی هەرمانیش هەر بەرەو موکریانی هێناوە و لە باوەشی بداخ سوڵتانی گرت، لەگەڵ هاواڵی خۆشەویست و یاری سەردەمی سەخڵەنی و دەربەدەریش، بوونەوە هەژار هێمنەکەی جاران و مەلا غەفووری بەسۆز و دڵ بەکوڵیشیان لە ئامێز گرت.

ئەمجار ورد دەبینەوە لە شێعری ١٩ لاپەڕەی "من و بولبول" کە چۆن بولبول ئەو خەسپیلانە ڕەزا سووکە لە خەزانی عومری دا، وتەی ئاوێنەی خەم دەکا و لەگەڵ گوڵ و گوڵزاری بەهاری نادباری خۆی دەدوێ و لە ئاکامیشدا پێیان شاد و شوکور

دەبێتەوە، بەڵـــام هەژارەکەی کورد بە دڵـــداری خۆی ئاگا و بە ســـروودێکی جوان کۆتایی بە وتار دێنێ و هەرگیز هومێدیش لە دڵان دا نامرێنێ.

«بولـــــبـــــول ئـــــەی یارەکـــــەی دێرین
خونچـــــیلانەی دەنـــــووک زێـــــرین
وەبـــــیـــــرت دێ پـــــایـــــیـــــزی پـــــار؟
رەشـــــپـــــۆشـــــی دەشـــــت و زەردی دار
گـــــژە و گـــــڤـــــەت لـــــە با دیـــــبوو؟
هـــــەوای پێش تـــــەرمی شـــــادی بـــــوو
دەیـــــدا خـــــشـــــپـــــەی گـــــەڵارێـــــزان
خـــــەبـــــەری مـــــەرگـــــی ئازیـــــزان
ســـــوێســـــنـــــە و مێلاقـــــەی زەرد و ســـــوور
بـــــوونـــــە دەســـــتـــــەچـــــیـــــلەی تەنوور
دەگـــــریـــــای بە بانـــــگ، بـــــە هـــــاوار
بۆ خـــــونـــــچـــــە، بـــــۆ گـــــوڵ، بۆ بەهار
تـــــەم گـــــوت هـــــەتا ســـــەر وا نابێ
چـــــاوت لـــــە بـــــەزەیـــــی خـــــوا بێ»

دەبینین بە هومێد دان بە ژینە کە هەستی جوان بە واژەی چەندە ساکار و پوخت و پاراو رازاوەتەوە.

لە وەرگێڕاوەکانیشی دا ئەگەر گەورەپیاوانی وەک خەییام و پووشکین، هەر لەم دنیایەدا بژینەوەو فارسی و روسییان لەبیر

نەچووبێتەوە و پەریان دەرسی کوردیشیان دادابن، ددان بەوەدا دەنێن کە بەراستی هەژاری کورد، وەرگێڕی شێعری مە نیە و هەڵبەستەکانی سەربەخۆ و جیاوازن لە "هەڵۆ" و "چوارینەکان"ی ئێمە. بەڵام هەر بە تەرجەمەی ناو بردوون، چونکە نووسراوە ناوبراوەکان ئەوەندە بەرز و پڕ مانان کە وەرگێڕی هەر گەلێک شانازی بە تەرجەمە کردنیانەوە دەکا.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم چوارینە:

ئــەم بوون و ژیـانەی هەیە چۆن رووی داوە
ئەم گەوهەرە تا ئێســـتە بە کەس نەسماوە
هیچ کەس نەبووە و نیشــە بە راست بیزانێ
هەر کەس بە خەیاڵ شـــتێکی بۆ هەڵـــداوە

لەگەڵ ئەم چەند بەیتە لە پیرە هەڵۆ:

«کــێ بـــە ســـەرسەرری ژیـــانێ تاوێ
ژینی قاڵاوی بـــە پــــووشــــێک ناوێ
چـــــاوەڕێی مــــەرگە گـــیان با بسیبا
پـــــەڕ و بـــاڵـــم لـــە چـــیا با بسیبا
بـە هەڵـــۆیی کە لە ژین بێ بەش بـــــم
نـەک هـەزار ســاڵـــە قـەلی رووڕەش بم

بۆ شــتێک ئــێستە لـــە خـــۆم بێزارم
من، هەڵـــوبـــۆ چی بـــە تـــۆ بوو کارم »

بە باشـی دەر دەکەوێ کە وەرگێراوەیەکی ئاسایی نین و زیاتر ئیلهامە کە هانی بە گوتنیان داوە.

بـەڵـــێ: بـەشـێکی زۆر لـە هۆنراوەکـانی مامۆسـتای پایە بەرزمان، وەک غەزەلی:

ئـەرێ ئـەی کیژە کوردەی چـاو کـەژاڵـــە
ئەرێ ئەی شـۆخ و شـەنگەی چواردەسـاڵـە
ئـەتـۆ خـۆت کورد و خوێنی لاوی کوردان
بـە ترکی چـاوی مـەسـتت کرد حەواڵـــە

...

خـۆ لـە قـەرەی شـێعـرە بـەررەکـان دەدەن، وەک " نـاڵـەی جودایی"، "بزە" و "جوانی بێنـاو" لە سـەر دڵ دەنیشن و کەسەران سارێژ دەکەن.

وتـار کۆتـایی پـێ بێنین بـە چـەند بەیتێک لە پێشـەکی یە جوانەکەی "بەرەو موکریان":

« شـــەوە تاریـــکە کـــش و مـاتـە زەوی
کـەوتـە خـەو کێوی، کـەوی، دار و دەوی
تـــوونـــەک و گـــوێـــن و کوند و شیارن
رۆژ وچـــانسیانە بـــە شـــەو پـــڕ کارن

شنه بای ورده گوڵاو ئەپرژێنی
پێی سپێراوە گەڵا داژێنی
ئاگری شوان ئەگرێ لەو دوورە
بووکی خێوی شەوە تارای سوورە
چار و بارەش کەڵەشێر ئەخوێنێ
بانگ لە ئەستێرە دەکا بیدوێنێ
گەشن ئەستێرە چ بەرزن چ نەوێن
گشتی پێت وایە ئەویندارى زەوین
زۆر بە پارێزەوە هەست رادەگرن
بە هۆمێدێکەوە چاو دادەگرن
مانگ ئەوا تازە لە ئاسۆ دەردێ
کۆمەڵێ هەورە سپیلکەی بەردێ
وەک منالی کزی باب ئاوارە
چاوەڕێی بوون وەگەڕێ دووبارە »

ئێمەس بە ئاسەوە چاوەڕوانی بەرهەمە بڵاو نەکراوەکانی مامۆستاین.



لە گەڵ شیعری پرسەی بەڕێزان" شەریف، ئاسۆ، خاڵەمین کاک رحمان قاری و ..
لە سروەی ژمارە ٥٨ی بانەمەڕی ١٣٧٠ی هەتاوی دا چاپ کراوە.

# بەشی چوارەم

## ( چەند کورتە پەخشان)

- گەڕانەوە
- کام فەلسەفە
- کام زاراوە
- هەڵە
- دەلە

# گەڕانەوە

نیو سەدەیەک بە سنووری مێژوو دا گەڕابوومەوە کە لە کابرایەکیان دەگێڕاوە:

« دوای ماوەیەک مانەوە لە فەڕەنگ، بێواز بوونی بێ هاواڵی، ماڵاوایی پێ لە کوڕ دەکا. لە گەڕانەوە دا لە هۆتێلێکی شاری ئەستەمبووڵ، تەنیا دیوێکی دوو تەختیی گیر دەکەوێ.

لە هەشت و نۆی شەو دا کە هاو وەتاغیەکەی دێتەوە، هەر وەک فەڕەنگ بە تەکاندانی سەر و دەست، دەیدوێـــنێ و لە پـــڕ قسەیەکی لە زار دەترازێ و کابرا دەڵێ:

ئای ئەوە تۆ کوردی ؟ !

- بەڵێ کوردم،

دوای خۆش و بێشێکی زۆر و گێڕانەوەی سەفەری لای کوڕەکەی، دەپرسێ:

ئەی تۆ کوردی کوێی؟

- خۆ من کورد نیم، جوولەکەی ناو کوردەواریم.

تا نیوە شەو کە تێر قسە نابن، هەر تاو نا تاوێکیش لە کابـــرای جوولەکە راست دەبێـــتەوە، ماچی دەکا و دەڵێ:

یارەببی بە قوربانت بم کافرەکەی وڵاتی خۆمان!»

هەر بۆیە:

«وەک پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور»

بەرەو رووگە و روو بە دڵدار شاباڵ دەبزێون.

بەسەر و سامانێکەوە دەلالێنەوە

«داخی تۆم هەر پێوەیە سەد جار دەرم کەی دێمەوە»

وەک راسپاردەیەک

پەریی خەیاڵ دەکەنە سەر قافڵەی کاروان و بۆ«سەیری خاکی موکری»بە شنەی نەرمی شەماڵی دەسپێرن.

یان لە بەر بزۆزی، پەرپوەی هەندەران دەبن و بە ئارامی، «ناڵەیان تێکەڵ بە ناڵەی نەی دەکەن» بۆ ئاهەنگی گەڕانەوەیان.

ئەی دوای گەرمێن و کوێستانێک بە دەربەندێک دا، لە چادر و چیغی هەوارێکەوە، بە چاوی لێکدانەوەی سەدان رەنگی «پەپوولەیەک» تەنانەت هەست بە قوژبنی گیرفانەکانیش دەکەن.

دەنا بە هاتنە سەر شاباڵی هونەر لە ئاسمانی زانکۆ را:

«ئەگـــەر ئەمجارە بێنـــەوە، بە دار گوێــزە بەرزەکانا هەڵ دەگەڕێن. سەرنج دەدەن گوڵە گەنم چۆن زەرد دەبێ، داب و نەریتی وڵاتان بۆ منداڵان دەهێننەوە.»

ئا ئێستایە کە دڵ واو بە واوی رازە نادیارەکانی هەر شێعرێکی گەڕانەوە لێک دەداتەوە و تێبیش دەگا کە خۆ بەقوربان کردنی

جووله‌كه‌كه‌ی هاوزمانی كابرایش، چ تام و له‌زه‌تێكی به‌ نتری بووه‌،
ده‌ستیش به‌رز ده‌كاته‌وه‌ و ده‌ڵێ:
سه‌ربه‌ست بی ئه‌و ده‌ڤه‌ره‌ی كه‌ هه‌ستی خۆشه‌ویستیی زێدی ئاوا
به‌ هێزه‌ !



# کام فەلسەفە؟

بۆ ئێمەیەک کە زەمانمان نامی تاڵی هەزاران ئاواتی ژێر گڵ نراوی چێشتبێ و بیر و هەستمان بە تاڵاوی مێژوویەکی بڕ لە ئاخ و ئۆف راهاتبێ، کەی رەوایە وەدوای تارمایی "هونەرێک" بکەوین کە بە خەیاڵ لە مەبەستی نووسەرەکانیان دەگەڕێین، یان تەشوێ تاش مانایان بۆ دروست دەکەین!

ئەوە خوداپێداوەکانن کە هەر چەشنە فەلسەفەیەک بهاوێژنە ناو هونەریانەوە، یان بە پێچەوانە هونەریان لە جەوهەری هەر جۆرە فەلسەفەیەک هەڵکێشن، نە ئاو لە ئاو تەکان دەخوا و نە خانووی ژینیان بێی تێک دەتەپێ.

من راه میروم که بدست آورم غذا
خواجه برای هضم غذا راه میرود

بەڵێ: ئەو مەکتەبانەی کە بۆ دەرباز بوون لە بەند و داوی کۆنی هونەری، سەر و گوێی هەچی شێوەی فەلسەفی یە تێک دەکەنەوە، بۆ کۆمەڵگا دینامیکی یەکان یاسایەکی ئاساییین، بەڵام بۆ ئێمەی بێ دەرەتان کە لە گێژاوی رەنجەڕۆیی دا پەلەقاژەمانە، هونەری وەک "ئیسکیپیسم، دوامۆدێرنیسم و ..." ناتوانن سارێژەری برینی دەرد و مەرگی ئەمڕۆمان بن. پێشم وایە بەتیا هەر بەو ئاوانەوە ماوین کە رۆژێک بێ و هێزی خامە لە ژێر فەرمانی بیر و ئەندێشە

دا، لە گۆماوی خەم و زووخاو ڕەهامان کا و بەرەو مەکۆی شادی هەنگاو بنێین، ئەو کاتەیە کە دەتوانین سەبک و شێوازی چیایی و ڕەنگاوڕەنگ بۆ جەژنی ژین دەستەمۆ کەین.

بەلێ لە سەر فەرشی نەرم و تۆلی بە ئاوریشمی چین چندراو، بە بێ خەم و خەفەت بە زمانێکی دوور لە ژیان خەون و مەونی دەقەرە کۆست کەوتەکان بە ئارەزوو لێک دەدەینەوە، خەون هەستی وەها تەنیوین تەنانەت بەری کەکرەی وەلانراوی هەندەرانیش دەکەینە نوقلی نەورۆزانە و پێشمان وایە بە بەرزایی بەژنی هونەر سەرمان گەیوەتە هەوران و بەم شێوەیە ئەوەی دەیلێین نایلێینەوە.

دەریا دەمی شێعری ژینی
بۆ خەونەکان دەکاتەوە
پەپوولەیەک لە گۆمی مەندی ئاگرا
گۆیەن
لە هەرچی باڵدارە
دەباتەوە
برووسکەیە
کە بەحری هەوری ژین دەچرژێنێ و
ئورانووس
لەسی ژاکاوی
ئا لەو خوێناوە خەستە دا

دەشواتەوە
ئەو وەرزە وا
کە چۆمی گڕ
سەدان ئاشی پێ دەگەڕا
بەفر
دەبوو بە سۆبەیەک
بۆ ژوورێکی بێ پەنجەرە و
لە سەر تەق تەقە بەردەکان
پۆلوویش
لە چەشنی جەنگەڵێک بۆنی گوڵیان تێ دەگەڕا
پەنجەرەکەی ژووری ئەوین
کە خوێنی ژینی مژتووە
وا دیارە هەر بە دەستی ڕۆژ
خەنجەر لە جەرگی شەو دەدا
پاسەوانی تەلاری گەورەی شارەکەش
بێژنگ بە دەست
ئارام ئارام
کۆی ئەستێران لە کەو دەدا
ح ف

بێ گومان، هەر پەلێکی لە ژین داتەکاوی ئەم شێعرە مانای تایبەت بە خۆی هەیە. ئەوە زمانێکی فەلسەفیی منالانەی دوور لە درۆیە کە دەپرسێ:

ئەرێ داگیرسانی سۆبەی بەفر و زار کردنەوەی دەریا بۆ خەوتەکان یان رازی لە بێژنگ دانی کۆی ئەستێران دەبێ چ بێ؟
ئەی دوای زانینیان لە بازاڕی هونەر دا چ دەرمانێکن بۆ لە ناو چوونی بە سەدان دەردی ئابووری،کۆمەلایەتیمان لەم دەورانە کەس بە کەسە دا!



لە ژمارە ٤ی گۆڤاری مهاباد دا بلاو بوتەوە.

# کام ناسراوە؟

کار و باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی تایبەت بە هەر مەڵبەند و شوێنێک، دەبێتە هۆی پێک هاتنی واژەیەکی زۆر بۆ ئەو شتانەی کە لەو ناوچەیە دا بە بایەخن.

- وەک چۆن لە ناو عەرەب دا، بۆ شێر و وشتر، بەفریش کە لە ناو ئیسکیموو دا وەک ئامرازێک بۆ خانووبەرە،بۆ دانانەوەی داوی راوە گورگ و ورچ، بۆ کەرەسەی رێ و بان و زۆر شتی تر بەهرەی لێ وەر دەگیرێ و زیاتر لە هەشتا واژەیان بۆ وێنە جۆراوجۆرەکانی هەیە.
- لە مێژووی ژاپۆن دا، دەسەڵات داریی توند و تیژی رابردوو بۆتە هۆی پێک هاتنی ئەو رەسمە لە خوازبێنی دا، کە کەس و کاری زاوا ئەگەر دەیان واژەی وەک: بچوک، نۆکەر، خزمەتکار، کار لە دەست نەهاتوو و ... بۆ کوڕ هەڵ نەدەن، بۆ رێز و پلەی بووکیش واژەیەکی زۆرتری وەک: باڵا بەرز، چاو جوان،شیرین زمان، نازەنین و ... نەڕازێننەوە، خوازبێنی سەر ناگرێ. دیارە زانست و تیکنۆلۆژی تا رادەیەک ئەو رەسمەی شل کردووە.
- لە کوردەواریش دا دۆڵ و دەرە و چڕ و تەلان بە بەرد و دار و گزە بایەوە ، بۆتە هۆی پێک هاتنی زیاتر لە سەد واژەی وەک:

هاڕە، هاژە، خرمە، گرمە، سرتە، ورتە ... بۆ دەنگ کە کاک مەلا سەید ڕەشیدی حوسێنی شتێکی جوانی لە سەر نووسیبوو.

• لە وڵاتی چین دا پیتی ئەلف و بێ زۆرە و لە زمان ناسی دا بە ئیراد دەژمێردرێ، بەڵام تەنانەت بو دەنگی باڵی باڵندەش پیتی تایبەت بە خۆی هەیە.

• لە دورگەیەکی ئەندونۆزی دا، قەومێک دەژین کە نیو سەدە لەمەو بەر، سپی پێستیان ڕاو دەکرد بۆ خواردن. کۆمەڵ ناسێکی وەک "مارگرێت مێد" ی ئەمریکی کە بە پارێزەوە چۆتە ناویان، هۆی کارەکە بە زولم و زۆرێک دەزانێ کە لە سپی پێستانیان دیوە. لە بەر ئەوە پێی هەر غەریبەیەک بکەوێتە ناو دورگەکەیانەوە، چیی پێ ناچێ کە بە ئیما و ئاماژە، ورد و درشتیان هەست بە بوونی بێگانە دەکەن لە وڵاتەکەیان دا. کە ئەوەش خۆی شێوە زمانێکە.

• ڕستەی زۆر کورتی وا لە زمانی ئیسکیموو دا هەن کە بە چەندین دێڕی ئینگلیزی و فەڕانسی ماناکەیان تەواو نابێ.

زمان بۆ گەیاندنی پەیامە بە گوێگر، هەڵتەکاندنی شان، لێو هەڵقرچاندن و چاو تێک نانێک مانای وا دەگەیەنن کە بە زمانی ئاسایی قەت دەر ناکەون'

حرف و صوت و گفت را بر هم زنم
تا که بی این هر سه با تو دم زنم

دیارە لەو شێعرە دا مەولانا بە ڕێی عیرفان دا دەڕوا،بەڵام لە ناو هێندێک لە زمانە نەناسراوەکان دا بە بێ عیرفانیش، بێ زمانی خۆی زمانێکە.



سەرچاوە:

پۆلی کۆپی یەکانی ڕشتەی کۆمەڵناسیی دانیشگا تارانن کە بە داخەوە لە لام نەمابوون کە ناویان بەرم، ئیرادیش وەک تیخەڵەیەکی کول لە سەر ئەستۆمە.



# هەڵە

پێم وابوو کارێکم کردووە کە هێندێک لە پەندی پێشینیان بەم شێوەیە دەسکاری بکەم:

مەسەلێکە ومن پێم وایە
بە بەژنی کوردیان بڕیوە

بە پیاوی چاو چنۆک دەڵێن:
«وەکوو کوردی دۆ نەدیوە»

ئەی بۆ ناڵێن کوردی فەقیر
لە دۆ زیاتر چی دی دیوە!

دوای لێ ورد بوونەوە بە کارێکی ناڕەوام زانی کە گوڵزاری ئەدەبی پێشینیانمان بە لێکدانی قەڵەمی نالەباری ناشارەزایەک بشەمزێ.

لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی دا شاعیرێکی کوردی دەرباری ئەمیرانی سامانی، لە سەر دانێکی مەوتەنی خۆی دا ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە. هۆی مانەوەیشی بە شێعر دەکا بە نامە و بۆ وەزیری دەرباری دەنێرێ،کە ئەمە بەیتی ئاخریەتی:

بخارا خوشتر از لوکر، خداوندا همی دانی
ولیـکن کُرد نشکیـبید از دوغ بیـابانی*

ئەم بەیتە ئاوێنەی تەواو باڵای نواندنی مانای «کوردی دۆ نەدیوە».

لۆکەرانیی شاعیر، ئەوەندە تامەزرۆی دۆی مزری مەوتەنەکەی بووە کە خۆشترین شار و بارەگای ئەو سەر دەمەی بۆ بەجێ هێشتووە، هەر بۆیە دووو پاتی دەکەمەوە:

کە بە ڕاستی نابێ باخچەی پڕ گوڵی فۆلکلۆریمان، بە درمغی ناڵەباری ناشارەزایان بشەمزێ.



* لە کتێبی «کرد و پیوستگی نژادی او» دا هەموو شعرەکە هەیە.

## ده – له

له بەر خواحانەکانی دانیشکەدەی ئەدەبیاتی دانیشگا تاران، چەند برادەرێک لە سەر (دە – له) کێشەیان بوو کە:

دەو شارە دا یا لەو شارە دا، دەو ژوورە دا یا لەو ژوورە دا.

کامیان راستە و کامیان هەڵەیە. کێشەو هەرا توند بوو. منیش دەبوو بڵێم:

هەرا لـە سەر دە یە و لە یە
بۆ برانــەوەی ئەم کێـــشەیە
بە من دەکەن بێ سێ و دوو
سەی پێـوەنێن بــەو دەولەیە



دە = (در)ی فارسی

لە = زیاتر (از)ی فارسی

کە لە موکریان ترازای هەر (لە) دەبیسی و لە وەرگێرانیشی دا بە فارسی لێت ناشێوێ.

# بەشی هەشت

- کام نەتەوەین
- بی نام
- دست حسد
- نوای غم

# کام نەتەوەین؟

کە دەیگرن لێی دەپرسن:

کوڕە ناوت ؟

ناوم سەدیق، فامیلیشم خاتەمییە

: لەکام نەتەوەی ؟

- نازانم.

: چۆن نازانی ؟

- چونکە خوێندنم بە فارسی بووە، بە تورکی ئاڵ و وێر دەکەم،

وت و وێژم کوردی و دوعا و نوێژیشم بە عارەبی یە.

تۆ پێم بڵێ من چ تیرەیەکم ؟!



ئۆیە ئەم بەشە کەمەم بە زمانی خوێندنم کە فارسیە، پێشکەش کردن.

## بی نام

برون از هاله ای
بر دور رؤیاهای رنگارنگ
امواجی است
از تکرار تمرین شقاوتها
که میکوبند بر لوح دل ریشم
نمی دانم!
مگر قلبی
که بالاپوش اندام شهامت بود
پوسیده است؟!
که در دستان کابوسی است
سرد و بی سخن
" از جویش بی خویشم"؟!

..............

نمادین پیکری
از جوهر جرات بباید ساخت
که بردارد
طلسم وهم و وحشت را
به کلی از بر و پیشم

## دست حسد

زمهریری است
که در وادی طولانی شب
شبح تیره و نامرئی **دل**
تیغِ آلوده به زهر حسد اندر کف دست
بنگاهید
نهاد دل مرموز سیاه
می زند شاهرگ گردن دلها را
آه
اینچنینیم در آغوش تباهی،
افسوس
که اسیریم و
در اقلیم سیاهی محبوس

واژەهایی را به امواج بحر سبک عراقی سپردیم که در ساحل، نیمه جان لاشه‌ای را یافتیم به نام.

## نوای غم

چون نگاهی رهگذر بر چند و چونم کرد و رفت
بـر ره عشـقی پریشان رهنمـونـم کرد و رفت

قطـــب افلاک فـنون اندر فصـول درس عشق
با رمـــوز چنـــد سطری آزمونـم کرد و رفت

عـــزت است آری که جانان با عطای نکهـتی
همــــدم عشــاق بیـدار قرونــم کرد و رفت

آمـــد و در هم دریـد آن پـردهٔ اســـرار دل
از در و کاشـــانهٔ خویـــشم برونـم کرد و رفت

می نـــدانم یافـتن دل را که همچون واله ای
با عروجـــش راهی کوی جنـونم کرد و رفت

مـــن اگر آهنـــگ شیون را نـــوازم، آن صنم
از نواهـــای حـزین غــم، فزونـــم کرد و رفت



بەیێکە لە عارفنامەی ایرج میرزا

سیاســـــت پیشـــــگان در هــــر لباســــند
بـــــه خـــــوبی همـــــدگر را میشناســـــند

سیاســـەت چـی ئـەگـەر لێکـیش نـەدیون
هـــەموویان یـــەک لـــە زاری یـــەک تفیـــون

## چەند دێڕێکی لێک نەبان

- کۆچ
- ئەگەر
- رابوون
- اقبال
- خێل
- ئازەری چ زمانێکە؟

# کۆچ

تیشکی نیونیگای پەریی شێعری جوان
دەدرەوشا لە سەر لاجانگی گوڵان
دیبووی کە ئێمە کز و پەشێوین
ببوە پەڕیوەی چرای نیشتمان

شکۆیەک کە بەو پەریە درا بوو
نەخش و نیگاری تەونی خودا بوو
بە بڕوای پاکی ڕێبوارانی شەو
شەبەقی وە بەر دڵان هێنا بوو

ئێمەی خەواڵووی جەنگەی خۆرهەڵات
پێمان نەزانی چی لێ بە سەر هات
تا شوعلەی لە سەر پەردەی مێرغوزار
بکەین بە بەرگی بووکینیی وڵات

بە قسەی هەڵاڵان دەمێک بوو پەری
وەک کیژی سرک و سڵی کۆچەری
« هەر کۆچ کۆچی بوو *» وا دوور کەوتەوە
بە مانگ و ساڵیش نایێ خەبەری

پێم وا بوو پەری وا لە سەر دڵان
بۆتە ئاودێری گوڵزاری یەزدان
بەڵام بەبێکە دڵداران دەڵێن:
کەشتیەوانێکە لە دەریای هەرمان

خۆزگە بای شەماڵ خۆی ببزوێنێ
لە لای پەری را پەیامێک بێنێ
بە ئیمزای خێوی سوبحی ئازادی
ئێمەی خەواڵووی پێ راپەڕێنێ

تاکوو هەمیسان ئەو پەریە جوانە
کە سۆی ترووسکەی دیدەی دڵانە
نیسونیگایەکی بێتەوە سەرمان
بۆ کۆچ کردنیش نەبێ بەهانە

۱۳۷۵ هەتاوی

* هەر کوچ کۆچت بوو، کۆچت کرد بە راست،
ئاخری کۆچت کرد ماڵاوات نەخواست

فۆلکلۆر

# ئەگەر

که حێلی پەل لە سەر هەوران، لە مەیـدانی جلیت بازی
بە بێ سواری بەهەڵمەت قەت بە پـڕتاو و بـە تـین نابێ

لە بەر کانیـاوی کۆشش دا، زەوی و زاری ئەمـەل، نەڕوێ
گوڵی شادی لەسەر سینگ و بەرۆکی بـووکی ژیـن. نابێ

لە سەحرای رووتـەنی بێ ئاوی ئـێمەی بـێ دەس و داماو
پەلی هیوا بە سوێراوی گڕاوی "خـۆزگە"، شـین نابێ



## ڕابوون

ساتێ هات لە سای داری ئازادی
بوو بە زەمزەمەی ئاهەنگی شادی

پەلێک لەو دارە بە یاران بێژن
لە سەر مەزارم وەهای بنێژن

ریشەی بێتە سەر کاژەڵەی سەرم
تا پەپوولەی رۆح بێتەوە بەرم

بەڵکوو بۆ ساتێ لەو خەوە رابم
لە گۆڕی تەنگا پێی ئاشنا بم

بۆنی شێعری سەر مەزاری مامۆستا هەژاری لێ دێ



## اقبال

آدم از بی بصـــــــری بندگـــــی آدم کرد
گوهـــری داشت ولی نذر قبـــاد و جـــم کرد

یعنی از خـوی غلامی ز ســگان خوارتر است
مـــن ندیدم که سگی پیش سگی سر خم کرد

اقبال



له بەر جوانی مانای، نەمڕوانیە کەم و کووڕیی کێش و قافیە لە وەرگێڕانی دا.

زۆر سـەیرە بەشـــەر ئـــەوەندە شــــانی داخا
فەڕشــــــی شەڕەفــــی لە بارەگای جەم ڕاخا

یانـــی لە سەگیـــش کەمتـرە ڕێزی ئیـــنسان؟
کـەی سەگ بووە بۆ سەگ سەری تەعزیم داخا



# هێل

(کـــاژو) کچـــی نـــەدار و دارای لـــە چەنـــد دێـــڕ دا بـــە نـــاوی («لـــوچ»)هەڵســـەنگاندووە، بـــا بـــە کـــوردی کـــێش و قافیەیشـــی هـــەبێ. لـــە درێـــژ کردنەوەیشـــی دا، کـــوڕ باشـــتر دەگونجـــا لـــە کچ.



بـازرگانێـــکی سامانـدار
ڕووی کردە پیاوێکی نەدار

کە تۆی وەها بە هێز و تین
لە بەر چی نەبانی لە ژین؟

بیستـــوومە کوڕێکت خێلە
گۆیـــا نەختالـێکیش گێلە!

کوڕی گەورەی منیش وایە
هەر چی بێ کاری خودایە

زۆر ئیرادە لای ئەم و ئەو
بۆ زمانت شل کەی جڵەو

گوتی دیاره کوڕی نەدار
گێلە لە بەر چاوی نەیارا

دەزانی چەند لە یەک دوورین؟
لە گوێن خەڵووز و کافوورین

ئی تۆ هەچی کۆشکی جوانە
ئەوەی وا لە بەر دڵانە

پارەی بە بەستەی نەژمێراو
میوەی تورتی زەویی تێراو

چل چرای حەوشە و بارەگا
کە شۆقیان بە کەیوان دەگا

ئەوەن ئەو دەبینێ بە دوان
سەر خۆشە، شادە بە هەموان

کەچی جەناب، خێڵەکەی من
لە گەڵ شادی بوون بە دوژمن

هەچی هاوڕێی کوڕەکەمە
فورەوسەری و دەرد و خەمە

خێر و بێری خوای نەدیوە
چارە نووس جەرگی بڕیوە

دیوی نزمی تاریک و توون
بیوازاوی بێ تام و روون

ناو چاوی تاڵی خاوەن کار
پێدادانی تەوس و پلار

تیتوڵی چۆغەی هەڵدڕاو
ناڵەباریی پینەی پێڵاو

یەک بە دووی بۆ نایەنە ژمار
لێی دەبن بە یەک بە هەزار

کە دەیشبێتە چلەی زستان
کوچە و کۆڵانە و ورکە نان

منالیش بەکتر قاو دەکەن
دێن و گاڵتەی بە چاو دەکەن

بۆیە دڕدۆنگم لە ژیان
هیوادارم بە دڵ و گیان

دەور و دوکـــان وا نـــەمێـــنێ
گەنجی ئێمەش جوان بنوێـــــنێ

١٣٥٤ هەتاوی

## ئازەری چ زمانێکە؟

دەزانین کە زمانی تورکی لقێکی گەورەیە لە رشتەزمانی ئۆراڵ ئاڵتایی و نزیکەی سی چل ساڵێک دەبێ بە بێ لێک دانەوە و هەرو رەمەکی بە "ئازەری" ی ناو دەبەن. هۆی ئەم هەڵەیە بە بۆچوونی من ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لە زانا و نووسەران جیاوازی نێوان دوو زمانی تورکی و ئارەرییان لێ روون و ئاشکرایە. بەڵام لەبەر تەوس و توانجی هیندێک رەگەزپەرست و زبان شڕی گاڵتەکەر بە زمانی گەلان، بە داخەوە لە روون کردنەوەی ئەم هەڵە گەورەیە خۆ دەپارێزن!!

ئەمڕۆ خەڵکی ناوچە لەگەڵ رێزنان لە زمان و داب و نەریتی یەکتر، سەربەرزانە شانازی بە زمان و ناسامەی خۆیانەوە دەکەن، وەک چۆن شەهریار لە بەندێک دا دەڵێ: حەیدەربابام بە زمانی شیرنی تورکی بۆ زێدەکەم رازاندەوە.

پێم وایە کوردی هەر شوێنێک بە ئاگری- ئازەری- ئایری یان ئاوری ناو بەرین، جێی خۆیەتی چونکە ئەم واژانە گشتی کوردین نە هی زمانێکی تر.

به بەر ئەوە کە لە هیچ کتێب و گۆڤارێک دا، شوێنی ژیانی ئازەری زمانەکان نەکەوتۆتە بەر چاوی من، بە پێویستم زانی ئەوەی کە خۆم راستەوخۆ دیومە و لە یادم ماوە بە کورتی بیخەمە بەر چاو:

لە سالی ١٣٥٣-٥٤ی هەتاوی دا لە زانکۆ تاران بەشی کۆمەلناسیی لە کلاسێک دا بۆ لێکۆلینەوە و کار و باری مۆنۆگرافی بەش بەش بووین. چەند هاورێیەکمان کە لێکۆلینەوە لە سەر زاراوەیان بەرکەوتبوو بەرەو ئەو شوێنە رۆیشتن کە ئازەری زمانی پێ دەژیان، دوای کۆبوونەوەمان لە رووی نۆت هەلگرتن و ئەو شریتانەی کە پریان کردبوونەوە ناوچە و زمانەکەیان بۆ شی کردینەوە کە لە ئارشیوی زانکۆ دا دەبێ مابن. ئەوەی لەم بابەتەوە من لە یادم ماون دوو بەش بەم شێوەیە.

١ ناوچەکەیان:

لە دەور و بەری شاری " زنووز " زیاتر لە پەنجا گوندی ئازەری زمانی لێیە کە ناوەندەکەیان ئاوایی "هەرزەنتات"ە و لە شاری مەرەندی ئازەربایجانەوە بۆی دەرۆی. چەند گوندێکیشیان کەوتوونەتە لای ئاستارا. لە ئاواییەکانی سەر بە تاکستانی بێوان

زەنگان و قەزوێن بە "تات" ی دەدوێن. ئەویش هەر دەبێ زاراوەیەک بێ لە زمانی ئازەری.

۲- وت و وێژ و ئاخافتنیان:

لە نووسراوە و نەوارەکان دا بۆمان دەرکەوت .کە واژە و رستەکانی ئازەری نزیک بوون لە کوردی، لوڕی و گیلی، هیچ پەیوەندی بە زمانی تورکییەوە نەبوو.

بە باشم زانی کە ئەم روون کردنەوەیە بخرێتە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز کە چیی تر ئەم هەڵەیە دووپات نەبێتەوە.

*لە ژمارە ۱٥۲ی گۆڤاری مهاباددا کەمێک بەرفلاوتر بلاو بۆتەوە.*

# تەرجەمەی شیعرێکی شەفیعی کەدکەنی

## ـ دەریا ـ

شەرمی ئاسمانم بە ئەوزەنگارەی
لە کۆشی خەودا ، کش وماتە ماوە
دەریام وبەرەوام لە سۆزدانی نیە -
دەریا دەوەسێکە خەوی شێواوە

ـ جەلال مەلەکشا ـ

## ئاواتێک

گە شاوردووی
دارستانی شیعری کۆن وتازەی گەلم
بەسەریەکا کۆکردەوە
بەگری دەستەچیلەی عاتیفەتێک
بوون بە ئاگر
بۆ وەجاخی لەمێژینەی کووژاوەوە
لە خەونێکا
رووناکایی ئەم مەشخەڵەم
بەمزگێنی
بۆ زەردەشتی خاوەن وەجاخیش بردەوە

ـ سەید ئەحمەد حەسەنی فەرد ـ

## ـ سەودا ـ

بۆ شکۆفەی گەشی بەهار
باسی خەزان:
لەباوەشی گەرمی ژینا
توانەوەیە
بۆ گەڵای زەردی پاییزی
باسی بەهار :
ئەفسانەیە
تا ----ی سروشت دەس بە داوێنتم
سەودای وەرزەکانت کورتە .

.. مارف ئاغایی ..



چەند بەرهەمێک لە نووسەر:

١- "لباس کردی" ٧٨ لاپەرەی تایپ کراو بە وێنەوە مۆنۆگرافیەکە کە لە کتێبی (منابع و ماخذ عشایر ایران بە فارسی)کۆ کراوەوەی دانیشگا تاران دا بە «منبع» هەڵبژێردراوە.

٢- ئەلف و بێی کوردی بە شێوەی باغچەبان کە لە ساڵی ١٣٥٨دا کورێک بووین لە سەر ویستی (فرهنگ و هنر)ی مهاباد لە دەورانی سەرپەرشتی کاک رەحمانی وەهاب‌زادە دا کارێکی چوار مانگیمان لەسەر کرد...

کە نزیکەی ٥٠ لاپەرەیەکم لەسەر نووسیوە.

٣- (شجره نسب قوم مامش) مۆنۆگرافی‌یەکەکە هەرکات نوێ بکرێتەوە، دەزاندرێ ئەو شوێنە چەندە لە شارستانیەت نزیکە. ( ٣١ لاپەرە)

٤- چەند مەقالەیەکی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هیندێک لە شێعری رۆژ کە ئەنیا تیف تیفەیان ماوە، بۆ بڵاو کردنەوە.

٥- کۆکردنەوەی دیوانی (مرحوم کوکەیی) لە ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی‌دا کە...



